چیرۆکی منداڵان و مێرمنداڵان

# جادووگەران

## ڕۆڵد داڵ

وەرگێڕ

نەسرین ئەحمەد










پێشکەشە بە

گوڵی باخەکەم تابان گیان

کە هەر لە ئێستاوە

حەز لە خوێندنەوە و نووسینی

چیرۆک دەکات




# خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی

• **جادووگەران** (زنجیرەی چیرۆکی منداڵ و مێرمنداڵان)

• **رۆڵد داڵ**

• **وەرگێران: نەسرین ئەحمەد**

• نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: **رێدار جەعفەر**

• نرخ: (٣٠٠٠) دینار

• چاپی یەکەم ٢٠١٥

• تیراژ: (٥٠٠)دانە

• چاپخانە: **چاپخانەی موکریانی (هەولێر)**

• لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٨٦) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە.

زنجیرەی کتێب (٩١٨)





**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## سەبارەت بە نووسەر

رۆلد داڵ نەرویجی بوو، بەڵام لە بەریتانیا لە دایكبووبوو، هەر لە وێش خوێندنی تەواو کرد. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بۆ کارکردن لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی **شێل** چوو بۆ ئەفریقیا. لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهانی، وەك فرۆکەوانی جەنگی چوو بۆ ناو هێزی ئاسمانی بەریتانیا، لە لیبیا و یۆنان و سوریا خزمەتی کرد. دوای ماوەیەك لە واشینگتۆن بە پلەی جێگری پەیوەندیی کاری سیاسی، لە هێزی ئاسمانی دەست بەکار بوو، هەر لەو کاتەشەوە خەریکی نووسینی کورتە چیرۆك بوو کە ناوبانگێکی زۆری پێدەرکرد. رۆڵد داڵ بە شێوەیەکی کۆمیدی و جوان، لە کەش و هەوایەکی تێکەڵ لە خەیال و راستی و وێچواندن، باسی پرسە پەروەردەیە کۆمەڵایەتییەکانی نەوەی نوێ دەکات. شێوەی نووسینەکانی نابراو زۆر دەوڵەمەند و شادی بەخشن. چیرۆکەکانی داڵ ئاوایەکی توندو هێرشبەر، هاوکات شیرین و سەرنج راکێشیان هەیە، وشە بە وشە خوێنەر بە دوای خۆییاندا رادەکێشن. ناوبراو یەکێکە لە سەرکەوتووترین نووسەری کتێبی منداڵ و مێرمنداڵان، کە منداڵانی سەرتاسەری جیهان کتێبەکانی ئەویان خوێندۆتەوە و، زۆربەی خەڵاتە بەناو بانگەکانی جیهان بەو کتێبانە بەخشراون.

بەرهەمەکانی ناوبراو بریتین لە: **چارلی و کارخانەی چکولیات**، **جادوگەرەکان**، **ماتیلدا**، **سەفەری تەنیا**، **کۆخە زەبەلاحەکە**، **دەرمانی ئەفسوناوی**، **خێزانی جەنابی گەمژە**، **مام رێوی سەر سورهێنەر**، **سالی من**، **چارلی و گەورە بالابەری شوشەیی**، **دێنی پالەوانی جیهان**، **دێوەزمەی میهرەبان**، کورِ. تێکرِای ئەو کتێبانە لە لایەن چاپخانەی(**نشر مرکز**) بلاوکراونەتەوە.

چاپخانەی(نشر مرکز) چوار کۆمەلە کوورتە چیرۆکی بلاوکردۆتەوە، کە بۆ تەمەنی گەورەترن، بە ناوەکانی: **ژنی خاوەن مال**، **دوێنێ جوان بوو**، **خاتونی من کۆترەکەم** و **خزمەتکار**.

# روونکردنەوەیەك لە مەڕ جادووگەران

لە ئەفسانەی پەریەکاندا، جادووگەران هەمیشە کڵاوی رەش دەکەنە سەریان و سەرشانی رەش لەسەر شانیان دادەنێن و سواری دەسکی گەسکەکەیان دەبن. بەڵام ئەو چیرۆکە، چیرۆکی پەریەکان نییە. ئەوە چیرۆکی جادووگەرە واقیعیەکانە.

گرنگترین شت کە دەبێ سەبارەت بە جادووگەران بیزانن ئەوەیە. بە وردی گوێ بگرن. هەرگیز ئەو شتەی ئێستا پێتان دەڵێم لە بیری مەکەن: جادووگەرە واقعیەکان جلی ئاسایی لەبەر دەکەن و سەروسەکوتیان بە تەواوی لە شێوەی ژنانی ئاساییە. ئەوان لە خانووی ئاساییدا دەژین و پیشەی ئاساییشیان هەیە.

هەر ئەو شتانەیە کە گرتنیان ئەوەندە قورس و ناخۆش دەکات.

جادووگەران ئەوەندە رقیان لە منداڵان دەبێتەوە، ئێوە ناتوانن هەر بیریشی لێ بکەنەوە. ئەوان ئەوەندە لەدەست منداڵان تووڕەن کە پێیان خۆشە بە قرچە قرچ لە ناو رۆندا سووریان بکەنەوە.

جادووگەرێکی واقیعی هەموو کات لە بیری پیلان گێڕی دایە تا لە چەنگ منداڵانی وڵاتەکەی رزگاری بێ. تەنیا شتێك کە دڵیان پێخۆشە ئەوەیە چۆن لە

ناویان ببەن. ئەوە تەنیا شتێکە کە بە درێژایی شەو و ڕۆژ بیری لێ دەکەنەوە. تەنانەت ئەگەر لە فرۆشگایەکدا لەسەر سندوقیش بێت و یا نامەکانی بازرگانێك تایپ بکات و یا بە ئۆتۆمبێلێکی ئاخیر مۆدێل لە ناو جادەکاندا خۆی بنوێنێ (و لە وانەیە هەر یەکێك لەو کارانە بکات)، لە ئاگری ئەو ئارەزووەدا دەسوتێ و هەموو فکرو زێکرو هەوڵ و خەم و خەفەتی تەنیا و تەنیا لە دەوروبەری ئەو فکرە کوشندەو خوێن ڕێژانە دەسوڕێتەوە.

ئەو بە درێژایی شەو و ڕۆژ بە خۆی دەڵێ" **نازانم ئەو جارەی دەبێ کام منداڵە لە ناو ببەم؟"**

جادووگەرێکی واقیعی بەو ئەندازەی کە ئێوە چێژ لە خواردنی قاپێکی پڕ لە فراولە و قەیماغ وەردەگرن، بە لە ناو بردنی منداڵێك چێژ وەردەگرن.

ئەو لەگەڵ خۆی قەرار دادەنێ کە هەفتەی یەك منداڵ لە ناو ببات و ئەگەر نەیتوانی ئەو ریکۆردە ئەنجام بدات، خوێنی زۆر بە خراپی بە جۆش دێت.

یەك منداڵ لە هەفتەیەکدا واتە پەنجاو دوو منداڵ لە ساڵێکدا.

**دروشمی جادووگەران ئەوەیە:**

**بیانگرە، لەسەر سەرت بیان سوڕێنەوەو هەڵیانده بۆ لایەك تا بزر دەبن.**

قوربانیەکە زۆر بە وردی هەڵدەبژێردرێ. دواتر جادووگەر وەکو راوچییەك کە لە ناو دارستان تەڵەی بۆ باڵندەیەك داناوە دادەنیشێ، ئێشك لەو منداڵە داماوە دەگرێ. بە ئارامی و بێدەنگی هەنگاو دەنێ. هێواش هێواش بە رێدا دەڕوات. ئارام ئارام دەچێتە پێشەوە و کاتێك هەموو شتێك ئامادە بوو... هێرش! و پرِدداتە منداڵەکە! پریشکەکان بەرز دەبۆونەوە. بڵێسەکان هەر کڵپەیان بوو. ڕۆنەکە هەر قرچە قرچیەتی . مشکەکان دەیاناڵاند. پێستەکە کۆ دەبێتەوە. و منداڵەکە غەیب دەبێ.



دەبێ ئەوەش بزانی کە جادووگەران نە لە سەری منداڵەکان دەدەن، وە نە چەقۆیان تێڕا دەکەن نە دەیاندەنە بەر تفەنگ. چونکە پۆلیس دەیانگرێ.

یەك جادووگەر هەرگیز دەستگیر ناکرێت. لەبیرتان نەچێ پەنجەکانی ئەفسوناوین و زوو تورە دەبێ. دەتوانێ وەك بۆق هەڵبەز هەڵبەز بە بەردەکان بکات و ئاگر بە سەر رووی ئاودا بڵاوبکاتەوە. ئەو هێزە سیحراویانە زۆر مەترسیدارن.

خۆشبەختانە، لە جیهانی ئەمرۆدا، ژمارەی جادووگەران ئەوەندە زۆر نییە، بەڵام بەشی ئەوەندە دەکەن ببنە هۆی نیگەرانی خەڵك. لە بەریتانیادا، بە هەموویەوە سەت جادووگەر بوونی هەیە. ژماردیان لە هەندێك وڵاتدا زۆر لەوە زیاترە و، شوێنەکانی تریش ژمارەیەکی کەمیان جادووگەر هەیە. لە جیهاندا هیچ وڵاتێك نییە لە خراپکاری جادووگەران بەدوور بێ.

جادووگەران هەمیشە ژنن.

نامەوێ باسی خراپەی ژنان بکەم. زۆربەی ژنان خۆشەویستن. لەگەڵ هەموو ئەوانەش بەراستی هەموو جادووگەران ژنن. جادووگەری نێر بوونی نییە.

بەڵام دێوەکان هەمیشە نێرن، هەروەها بوونەوەری سەیر و زەبەلاحن.

ئەو دوو جۆرە بوونەوەرانە مەترسیدارن. بەڵام ترسی هیچیان ناگاتە جادووگەرە واقیعیەکان.

تا ئەو جێیەی پەیوەندی بە منداڵانەوە هەیە جادووگەرە واقیعیەکان مەترسیدارترین بوونەوەری سەر گۆی زەوین. ئەوەی کە مەترسیدار بوونەکەیان چەند بەرابەر دەکات ئەوەیە، مەترسیدار نایەنە بەر چاو واتە بە رواڵەت ترسێنەر نین. تەنانەت ئەگەر هەموو نهێنیەکانیشان بزانی (چەند چرکەیەکی تر ئەو نهێنیانەتان پێدەڵێم ) هیچ کات ناتوانن دڵنیا بن لەوەی کە ئەو کەسەی لە پێش

چاوتانە یەك جادووگەرە، یا یەك خانمی پاك و میهرەبان. ئەگەر بەبرێك توانای ئەوەی هەبایە خۆی لە شێوەی سەگێکی گەورە دەربێنێ و کلکتان بۆ بجولێنێ، لێی دەچوونە پێشەوەو دەستتان بەسەرو گوێ دادێنا. ئەوکات دەتانزانی چیتان بەسەر دێ. جادووگەرانیش بەم شێوەیەن. شێوە و ڕواڵەتی هەموویان وەك خانمی میهرەبان و بەرەحمە.

تکایە ئەو ڕەسمەی لاپەڕەکەی تر بێننە بەرچاوی خۆتان. کام لەو خانمانە جادووگەرە؟ پرسیارێکی قورسە، بەڵام ئەوە پرسیارێکە کە دەبێ هەموو منداڵێك بتوانێ وەڵامی بداتەوە. بە هەمووانتان دەڵێم، لەوانەیە هەر ئێستاکە لە نزیك ئێوە جادووگەرێك بژیت. لەوانەشە ئەو ژنەی ئەوڕۆ لە ناو پاسەکە بەرامبەر بە تۆ دانیشتبوو و چاوی گەش و بە زەوقی هەبوو، جادووگەر بووە.



لەوانەشە ئەو ژنەی لە ناو جادەدا بەو شێوە جوان و قەشەنگە زەردەخەنەت بۆ دەکات و لە ناو ئەو پاکەتە سپیەی کە بە دەستیەوە بوو شیرنیەکی پێشکەش کردی، جادووگەر بووە.

تەنانەت لەوانەیە ـ بەدڵنیاییەوە بە خوێندنەوەی ئەو رستەیە سەرسام دەبن ـ لەوانەیە تەنانەت مامۆستا خۆشەویستەکەتان کە هەر ئێستاکە خەریکە ئەو وشانەتان بۆ دەخوێنێتەوە، جادووگەر بێت. بە وردی سەیری ئەو مامۆستایە بکەن. لەوانەیە ئەو بەو بیرۆکە بێ مانایە پێکەنینی بێ. رێگە مەدەن ئەو پێکەنینە ئێوە سارد کاتەوە. لەوانەشە ئەو پێکەنینە بەشێك بێ لە پلانەکەی.

بەڵام مەبەستی من لەو قسانە ئەوە نییە کە مامۆستاکەتان بە دڵنیاییەوە جادووگەرە. تەنیا دەڵێم لەوانەیە جادووگەر بێت. هەڵبەت ئەگەری روودانی زۆر کەمە. بەڵام... هەر ئەو "بەڵامە" گەورە، کارەکە خراپ دەکات، بە هەرحاڵ ئەگەری هەیە.

ئاخ، ئەگەر رێگەیەك هەبایە و چۆنیەتی ناسینی یەگجاری جادووگەرانی بە ئێوە نیشان دابا، ئەو کات هەموومان کۆ دەکردنەوە و دەمانکردنە ناو مەکینەی گۆشت. بەداخەوە رێگەیەکی ئەوها بوونی نییە.

بەڵام نیشانەی بچووك هەن کە ئێوە دەتوانن بە باشی لێیان ورد ببنەوە.

هەندێك خوی تایبەت و شاراوە کە لە ناو هەموو جادووگەراندا هاوبەشە و ئەگەر ئێوە لەو خوانەیان ئاگادار و هەمیشە لە بیرتان بن، لەوانەیە بتوانن پێش ئەوەی تەمەنتان گەوردتر بێ، خۆتان لە چەنگی ئەوان رزگار بکەن.

# نەنکم

بۆخۆم پێش ئەوەی ببمە حەوت ساڵان، دوو جار بە جیا رووبەرووی جادووگەران بوومەوە. لە یەکەمیان بە سەلامەت رزگارم بوو، بەڵام جاری دووەم شانسم نەبوو و زۆرم بەڵا بەسەر هاتن کە ئەگەر بۆتان بنووسم، دەست دەکەن بە قیژاندن. بەڵام چار نییە، راستیەکان دەبێ بگوترێن. من ئەو راستییەی کە هێشتا لێردم و دەتوانم لەگەڵ ئێوە قسە بکەم (هەر چەندە شێوە و رواڵەتم لەگەڵ ئێوە جیاوازە) تەنیا و تەنیا قەرزداری نەنکە ناوازەکەمم.

نەنکم نەرویجی بوو. نەرویجیەکان زۆر شت لەبارەی جادووگەران دەزانن، چونکە وڵاتی نەرویج بەو هەموو دارستانە چڕە و چیای پڕ بەفر و سەهۆڵ، شوێنێکە کە یەکەمین جادووگەران لەوێوە هاتوون. دایکم و باوکیشم نەرویجی بوون، بەڵام چۆن کاروکاسبی باوکم لە بەریتانیا بوو، لەوێ هاتوومە دونیا و گەورە بووم و چوومە مەکتەب. ئێمە ساڵی دوو جار، جەژنی کریسمەس و هاوین بۆ بینینی نەنکم دەچووینە نەرویج. تا ئەو جێیەی تێیگەیبم، ئەو خانمە پیرە، خزمی دایك و باوکم بوو. ئەو دایکی دایکم بوو و منیش عاشقانە خۆشمدەویست. کاتێك بەیەکەوە بووین هەم بە نەرویجی قسەمان دەکرد هەمیش بە بەریتانی. جۆری زمانەکە هیچ

بۆ من گرنگ نەبوو. چونکە هەردووکمان، هەردوو زمانەکەمان بە باشی دەزانین و دەبێ دانی پێدابنێم کە من خۆم بەو نزیکتر دەزانی لە دایکم.

دوای ئەوەی بوومە حەوت ساڵان، دایکم و باوکم وەك نەریتی پێشوو منیان بۆ پشووی کریسمەس بردە نەرویج تا جەژنەکەی لەگەڵ نەنکم بەسەر بەرم. هەر لەو شوێنە بوو کە ئۆتۆمبێلەکەمان لە جادەی شیمالی ئۆسلۆ کە سەهۆڵی بەستبوو هەڵخلیسکاو هەڵدێرایە ناو خرێکی پڕ لە گاشە بەرد. دەست بە جێ دایکم و باوکم مردن. منیش بە کورسیەکەی پشتەوە قایم بەسترابوومەوەو تەنیا ناو چاوانم رووشا.

ناچمە ناو وردەکاریەکانی ئەو دوانیۆەڕۆ ترسناکە. هێشتاش کاتێك بیری لێ دەکەوەوە، تەواوی لەشم لە ترسان دەلەرزێ. منیان گەیاندە ماڵی نەنکم و ئەویش بە توندی لە باوەشی گرتم و هەردووکمان تا بەیانی لە باوەشی یەکتردا گریایین.



من بە هەنیسکەوە لێم پرسی" ئێستا دەبێ چی بکەم؟"

ئەو وتی: تۆ لێرە لای من دەمێنیەوە و بەیەکەوە دەژین.

ناگەڕێمەوە بەریتانیا؟

ئەو وتی: نا، من ناتوانم ئەو کارە بکەم، هیچ شوێنێك بۆ من نابێتە نەرویج، دەبێ لە نەرویج بمرم.

سبەی هەمان رۆژ، نەنکم چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە تا خەم و خەفەتە گەورەکەمان لەبیر بکەین. ئەو چیرۆك گێڕوێکی بێ وێنە بوو و من شەیدای قسەکانی دەبووم. بەڵام شتێکی کە منی زۆر سەرسام دەکرد، مەسەلەی جادووگەران بوو. وا دیار بوو ئەو لەبارەی جادووگەران شارەزایی هەبوو و منی بە تەواوی روون کردەوە کە چیرۆکە سیحر و جادووەکانی بە پێچەوانەی چیرۆکەکانی تر، هەرگیز خەون و خەیاڵ نین. تەواوی ئەو چیرۆکانە راستی و واقیعی بوون. ئەوان راستییەکی تەواو بوون. ئەوان مێژوو بوون. هەموو ئەو شتانەی بۆ منی دەوت، بەراستی روویدابوو و بە قازانجم بوو بڕوایان پێبکەم. لە هەمووش خراپتر ئەوە بوو کە جادووگەران هێشتاش لەناو ئێمە دابوون. ئەوان لە هەموو شوێنێ بوون و بە قازانجم بوو بڕوای پێبکەم. جارێکیان لێم پرسی" نەنە گیان، بەراستی ئەو قسانەی دەیانکەی راستن؟ هەموو ئەوانە واقعین؟"

ئەو وتی: ئازیزم، ئەگەر ئەتۆ نەزانی چۆن دەبێ جادووگەران بناسی، ناتوانی لەو دونیایەدا بەردەوام بی.

بەڵام نەنە گیان، ئەتۆ دەڵێی جادووگەران وەکو ژنانی ئاساین. من چۆن دەتوانم ئەوان بناسم؟

نەنکم وتی: تۆ دەبێ زۆر بە باشی گوێ لە قسەکانی من بگری و هەموو ئەو شتانەی پێدەڵێم، فێریان بی و دواتر تەنیا کارێکی دەتوانی بیکەی ئەوەیە دوعا بکەی شتێکی خراپت بۆ نەیەتە پێش.

لەو چرکەساتەدا ئێمە لە ژووری دانیشتن لەناو ماڵەکەی لە ئۆسلۆ بووین و من خۆم بۆ نوستن ئامادە دەکرد. هیچ کات لەو ماڵەدا پەردەکان دانەدەدرانەوەو منیش دەمتوانی دەنکە گەورە و درشتەکانی بەفر ببینم کە لە دونیای تاریك و نوتەکەی دەرەوە بە ئارامی، دەهاتە خوارێ. نەنکم یەگجار پیر و چرچ و لۆچی تێکەوتبوو و لەش و لارێکی بەهێزی هەبوو کە جلێکی دانتێلی خۆڵەمێشی داپۆشیبوو. ئەو وەك شاژنان لەسەر کورسیە دەسکدارەکەی دانیشتبوو هێندە قەڵەو بوو جێگای نەبوو خۆی بجولێنێ. تەنانەت مشکێکیش توانای نەبوو لە تەنیشتی جێگەی خۆی بکاتەوە. من کە تەنیا حەوت ساڵان بووم، بە بیجامە و نەعلەوە لە پێش لاقی لەسەر زەوی هەڵتوتەکابووم.

جارێکی تر پێموتەوە" سوێندم بۆ دەخۆی گاڵتەم پێێ ناکەی؟

سوێندم بۆ دەخۆی وانیشان نادەی ئەو قسانەت راستە؟"

ئەو وتی: گوێ بگرە، لانی کەم پێنج منداڵان دەناسم کە بزر بوون و هیچ کەس جارێکی تر ئەوانی نەبینیەوە. جادووگەران بردیانن.

وتم، من هێشتاش هەر وا بیر دەکەمەوە کە دەتەوێ بمترسێنی.

ئەو وتی، تەنیا دەمەوێ دڵنیا بم تۆش، تووشی ئەو چارەنووسە نابی. من تۆم خۆش دەوێ و پێمخۆشە لە لای من بمێنیەوە.

وتم، پێم بڵێ ئەو منداڵانە چۆن بزر بوون.

تا ئەو کات نەمبینی بوو نەنکێك جگەرە بکێشێ.

ئەو جگەرەیەکی داگیرساند، جگەرەیەکی درێژ و رەش کە بۆنی لاستێکی سوتاوی لێ دەهات.

ئەو وتی، **یەکەم منداڵ کە بزر بوو، ناوی رانگیلد هەنێس** بوو. ئەو، ئەو کات هەشت ساڵان بوو. گەمەی دەکرد. دایکیان کە لە چێشتخانە خەریکی

دروستکردنی نان بوو، هاتە دەرێ تا هەوایەکی تازە هەڵمژێ و لە کچە بچووکەکەی پرسی رانگیلد کوا؟

خوشکی رانگیلد وەڵامی دایەوە، لەگەڵ خانمێکی باڵا بەرز رۆیشت.

دایکی وتی، کام خانمە باڵا بەرزە؟

خوشکی رانگیلد وەڵامی دایەوە، لەگەڵ ئەو خانمە باڵا بەرزەی کە پەنجەوانەی سپی لەدەست بوو. ئەو دەستی رانگیلدی گرت و لەگەڵ خۆی برد. نەنکم وتی، لە دوای ئەوە ئیتر هیچ کەس رانگیلدی نەبینیەوە.

پرسیارم کرد، ئەوان بە دوایدا نەگەڕان؟

ئەی چۆن، هەموو چەندین کیلۆمەتر بە دوایدا گەڕان، بەڵام نەیانبینیەوە.

پرسیارم کرد، ئەو چوار منداڵانەی تر چیان بەسەر هات؟

ئەوانیش وەکو رانگیلد بەزر بوون.

نەنەگیان ئەوان چۆن چۆنی بزر بوون؟

لە هەموویاندا، دروست پێش بزر بوونیان خانمێکی نەناسراو لە دەردوەی ماڵەکە بینراوە.

پرسیارم کرد، مەبەستم ئەوەیە کە ئەوان چۆن بزر بوون؟

نەنکم وتی، مەسەلەی دووەمی زۆر سەیر و سەمەر بوو.



بنەماڵەیەك بە ناوی **کریستەن سێن** هەبوو، کە لەسەرەوەی هوڵمەن گۆلێن دەژیان، ئەوان تابلۆیەکی رەنگی یان لە ژووری دانیشتن هەبوو کە زۆریان شانازی پێوە دەکرد. تابلۆیەکە چەند مراوی لە ناو حەوشەی ماڵێکی جوتیاری دا نیشان دەدا. ناو تابلۆیەکە مرۆڤی تێدا نەبوو، تەنیا چەند مراوی لە ناو چیمەنی ماڵێکی جوتیاری بوو و لە پشت سەریانەوە خانوو دەبینرا. تابلۆیەکی گەورە و تارادەیەك جوان بوو. رۆژێك کچەکەیان **سولوێگ** لەو کاتەی خەریکی خواردنی سێو بوو، لە مەکتەب هاتەوە ماڵێ. ئەو وتی کە خانمێکی میهرەبان ئەو سێوەی داوەتێ. بەیانی رۆژی دواتر سولوێگ لەناو جێگەکەیدا نەبوو. دایك و باوکی هەموو شوێنێك گەڕان، بەڵام نەیانتوانی بیدۆزنەوە. دواتر، لە ناکاو باوکی هاواری کرد **ئەوەتا!** سولوێگ نانی دەدا بە مراویەکان! بەراستیش سولوێگ لە ناو تابلۆیەکەدا بوو. ئەو لە ناو حەوشەدا راوەستابوو و بۆ نموونە لەناو سەبەتەیەك

وردە نانی بۆ مراویەکان دەڕشت. باوکی هێرشی برد بۆ تابلۆیەکە و دەستی پێدا هێنا. بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. ئەو ببوو بە بەشێك لە تابلۆیەکە.

نەنە گیان، ئەتۆ بۆخۆت تا ئێستا ئەو کچەت بینیوە لە ناو تابلۆیەکە؟

نەنکم وتی، زۆر جار، سەیر لەوەدایە کە سولوێگی بچووك هەر جارەی لەناو تابلۆیەکەدا دەگۆڕدرێ. رۆژێکیان لەناو خانووە جوتیاریەکەدا بوو و لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. رۆژێکی تر لە لای چەپی تابلۆیەکە بوو و مراویەکی لە باوەش دابوو.

نەنە گیان، بۆخۆت بینیوتە لە ناو تابلۆیەکەدا بجوولێت؟

نەنکی وتی، هیچ کەس ئەوەی نەدیت. ئەو لە هەر شوێنێ بوو، چ ئەو کاتەی لە پەنجەرە سەیری دەرەوەی دەکردو چ ئەو کاتەی لە دەرەوەی ماڵەکە نانی دەدا بە مراویەکان، بێ جووڵە بوو، تەنیا شێوەیەکی وێنە کێشراوی بە رەنگبوو. شتێکی زۆر سەیر بوو، بەڕاستی زۆر سەیر. لە هەمووش سەیرتر ئەوە بوو لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات، ئەویش لەناو تابلۆیەکەدا گەورەتر دەبوو. دە ساڵ دوای ئەو رووداوە، ئەو کچە بچووکە، ببوو بە ژنێکی گەنج. سی ساڵ دواتر، ئەو بە ساڵاچوو بوو، و پەنجا ساڵ دوای ئەو رووداوە، لە ناکاو بە تەواوی لە ناو تابلۆیەکەدا بزر بوو.

وتم، مەبەستت ئەوەیە، ئەو مرد؟

نەنکم وتی، چی بڵێم، لە جیهانی جادووگەراندا شتی زۆر نهێنی روودەدا.

وتم، تاکو ئێستا دوو رووداوت بۆ گێڕاوەمەوە، سێیەکەی تر چ بەڵایەکیان بەسەر هات؟

نەنکم وتی، **سێهەمیان بریژیت سۆنسێنی** بچووك بوو، ئەو لەو بەری جادەکەدا دەژیا. رۆژێك لە هەموو لەشی پەڕی دەرکرد و لە ماوەی مانگێکدا بوو بە مریشکێکی سپی زەبەلاح. دایك و باوکی سالآنێکی زۆر لە کولانەیەکدا ئاگاداریان لیّ دەکرد. ئەو تەنانەت هێلکەشی دەکرد.



وتم، هێلکەکانی چ رەنگێك بوون؟

نەنکم وتی، قاوەیی. تا ئەو کات هێلکەی وا گەورەم نەدیبوو. دایکی هێلکە و تەماتەیەکی خۆشی پێیّ دروست دەکردن.

لە نەنکم کە وەکو شاژنێکی قەدیمی لەسەر کورسی پاشایی دانیشتبوو ڕامام. چاوی لێلّ و تەماوی بوو وەك ئەوەی سەیری شتێك بکات کە چەند کیلۆمەتر لە ئێمە دوور بوو. لەو چرکە ساتەدا، جگەرەکەی تەنیا شتێکی واقیعی ئەو بوو و ئەو مژانەی لێی دەدا، هەورێکی شینی لەسەر سەری دروست کردبوو.



وتم، بەڵام ئەو کچەی ببوو بە مریشك، بزر نەبوو؟

نا، **بریۆیت** بزر نەبوو. ئەو ساڵانێکی زۆر ژیا و هێلکەی قاوەیی دەکرد.

خۆ تۆ وتت هەموویان بزر بوون.

نەنکم وتی، هەڵەم کرد. خەریکە پیر دەبم. هەندێك شتم لە بیر دەچێتەوە.

لێم پرسی، منداڵی چوارم چی بەسەر هات؟

نەنکم وتی، **چوارەمی کوڕێك بوو بە ناوی هێراڵد.**

بەیانییەك پێستی لەشی بوو بە خۆڵەمێشی - زەرد. دواتر وەکو پێستی گوێز رەق و توێڵك توێڵك بوو. ئێواریٚ، کوڕەکە ببوو بە پارچە بەردێك.

وتم، بەرد، مەبەستت بەردی راستییە؟

لەگەڵ ئەوەی تەمەنم زۆر کەم بوو، نەمدەتوانی بڕوا بە قسەکانی نەنکم بکەم.

بەڵام ئەو، ئەوەندەی بڕوا بە خۆی بوو و زۆر بە جیدی قسەی دەکرد و حاڵەتی شێوە و دەموچاوی گاڵتە کردنی پێوە دیار نەبوو و منیش وردە وردە لە بیر کردن ڕاچوو بووم. وتم، بەردەوام بە نەنەگیان. وتت ئەوان پێنج کەس بوون. پێنجەم کەس چ بەڵایەکی بەسەر هات؟

ئەو وتی، پێتخۆشە مژێك لە جگەرەکەم بدەی؟

من تەمەنم تەنیا حەوت ساڵە نەنەگیان.

ئەو وتی، گرنگ نییە تۆ چەند ساڵانی، جگەرە دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ کات تووشی پەسیو نەبی.

پێنجەمی چی بەسەر هات، نەنەگیان؟

ئەو کە قونچکی جگەرەکەی بە ئارامی دەجوو وتی، ئەوەیان کەمێك سەرنج ڕاکێش بوو. **ئەو کوڕێکی نۆ ساڵان بوو بە ناوی لیف** کە پشووی هاوینی لەگەڵ دایك و باوکی لە دورگەدا بەسەر دەبرد. هەموو خێزانەکەیان بۆ گەشت و گوزار ڕۆیشتبوون و لە نێوان گاشە بەردەکانی ئەو دورگە بچووکەدا مەلەیان دەکرد. لیفی بچووك خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکە، باوکی کە خەریکی سەیر کردنی بوو، زانی ئەو زۆر لە ژێر ئاوەکە ماوەتەوە. کاتێك کوڕەکە هاتەوە سەر ئاوەکە، ئیتر لیف نەبوو.

ئەی چی بوو نەنەگیان؟

یەك نەهەنگ.

گاڵتە دەکەی! چۆن شتی وا دەبێ؟!

ئەو وتی، ببوو بە نەهەنگێکی خۆشەویست و جوان.

نەهەنگێکی بێ زەڕ، کاری بە کەس نەبوو.

وتم، نەنەگیان...

بەڵێ، ئازیزم؟

بەڕاستی ببوو بە نەهەنگیکی واقیعی؟

ئەو وتی، بەڵێ. دایکی ئەوم بە باشی دەناسی. بۆخۆی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. ئەو وتی لیفی نەهەنگ ئەو ڕۆژە دوا نیوەڕۆ ڕێگەی دا خوشك و برایەکەی لەسەر پشتی دابنیشن. زۆریان پێێ خۆش بوو. دوایی باڵێکی بۆ ڕاوەشاندن و ئیتر کەس نەیبینیەوە.

وتم، بەڵام نەنە گیان، ئەوان چۆنیان زانی ئەو لیفە؟

نەنکم وتی، ئەو قسەی لەگەڵ کردبوون. لە تەواوی ئەو کاتەی لەسەر پشتی بوون قسە و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن.

پرسیم، لە کاتی ئەو رووداوە کەس هات و هاوار و قاو قیژی نەکرد؟

نەنکم وتی، بەو شێوەیە نا. لە بیرت بێ ئێرە نەرویجە، ئێمە لەو جۆرە شتانە



ڕاهاتووین. هەموو شوێنێکی ئەو وڵاتە پڕە لە جادووگەر. لە وانەیە هەر ئێستاکە لە ناو جادەکەمان یەکێکی لێ بێ. ئیتر کاتی خەوە.

بە کەمێك لەرزینەوە وتم، جادووگەران دەتوانن لە پەنجەرەوە بێنە ناو ژوورەکەم؟

نەنکم وتی، نا، جادووگەران هەرگیز لەو کارە گێلانە ناکەن، ئەوان هەرگیز لە دیواری ماڵان سەر ناکەون، روو بەندیش نابەستن و لەناکاویش لە ناو ماڵاندا هەڵناقوڵن. تۆش لەناو جێگاکەتدا لە ئەمان دای. بڕۆ بخەوە، من بەتانییەکەت پێدادەدەم.

# چۆن جادووگەران دەست نیشان بکەین

ئێوارەی ڕۆژی دواتر، نەنکم لە دوای شوشتنی من، بردمی بۆ ژووری دانیشتن، تا چیرۆکێکی ترم بۆ بگێڕێتەوە.

پیرێژن وتی، ئەمشەو دەمەوێ پێت بڵێم چۆن دەکرێ جادووگەران دست نیشان بکەین.

پرسیم، مرۆڤ دەتوانێ هەمیشە بە دروستی دەست نیشانیان بکات؟

ئەو وتی، نا، کێشەکە لێرەدایە، ناکرێ دڵنیا بین. بەڵام دەکرێ گومان لە هەندێك شت بکرێ.

سوتووی جگەرەکەی بەربۆوە سەر تەنورەکەی. هیوادار بووم پێش ئەوەی پێم بڵێ چۆن دەتوانم جادووگەران دەست نیشان بکەم، دەست بە جێ ئاگر نەگرێ.

وتم، خۆ ناکرێ هەمیشە دەستکێش بکەیە دەستت، هاوینان بەو گەرمایەش هەر دەستکێشیان لە دەستە؟

نەنکم وتی، هاوینانیش دەستکێش دەکەنە دەستیان. دەبێ دەستکێشیان لەدەست بێ. پێتخۆشە بزانی بۆچی؟

وتم، بۆچی؟

لەبەر ئەوەی جادووگەران نینۆکیان نییە. جادووگەران لە جیاتی نینۆك وەکو پشیلە پەنجەی خوارو نووشتاویان هەیە و بۆ ئەوەی بیاشارنەوە ناچارن دەستکێش بکەنە دەستیان. بەڵام با پێشت بڵێم، زۆربەی خانمە موحتەرەم و رێك و پێکەکان بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا دەستکێش دەکەنە دەستیان، لەبەر ئەوە، ئەو مەسەلەیە یارمەتییەکی زۆرت نادات.

وتم، دایکیشم هەمیشە دەستکێشی لە دەست دەکرد.

نەنکم وتی، خۆ لە ناو ماڵێدا لە پەنجەی نەدەکرد.

جادووگەران تەنانەت لەناو ماڵێشدا دەستکێش دەکەنە دەستیان. تەنیا لە کاتی خەودا دەریاندێنن.

نەنە گیان تۆ ئەو شتانە لە کوێ دەزانی؟

ئەو وتی، قسەم پێ مەبڕە، تەنیا هۆشت لە من بێ. دووهەمین شت ئەوەیە کە جادووگەرێکی واقیعی هەمیشە سەری رووتاوەتەوە.

وتم، رووتاوەتەوە.

نەنکم وتی، دروست وەکو کولەکە.

زۆرم پێ سەیر بوو. بەڕای من سەری تاس و رووتاوە شێوەیەکی ناموحتەرەم و ناشیرین دداتە ژنان.

نەنە گیان ئەوان بۆچی تاسن؟

نەنکم بە جنێودانەوە وتی، چووزانم. تەنیا ئەوە دەزانم سەری جادووگەران تەنانەت یەك دەنکیشی موو لێ نایەت.

چەند ترسێنەرە!

نەنکم وتی، باشترە بڵێی هێڵنج هێنەرە.

وتم، ئەگەر جادووگەران تاس بن، دەست نیشانکردنیان کارێکی قورس نییە.

نەنکم وتی، هەرگیز وا نییە. جادووگەران بۆ شاردنەوەی تاسیەکەیان پرچی دەستکرد دەکەنە سەریان. پرچی زۆر باش و ئەسلّ. هەر بۆیە ئاسان نییە لە پرچی سروشتی جیا بکرێتەوە، مەگەر ئەوەی کە قژەکانیان رابکێشین.

وتم، ئەگەر وایە دەبێ ئەو کارە بکەین.

نەنکم وتی، قسەی بێ کەلّك مەکە. چۆن دەبێ لە هەر شوێنێ خانمێکت بینی، بڕۆیە پێشەوەو قژەکانی رابکێشی؟ تەنانەت ئەگەر دەستکێشیشی لە دەست بێ. ئەگەر ئازا و نەترسی ئەو کارە بکە تا بزانی چ بەلاّیەکت بەسەر دێنن.

وتم، ئەگەر وایە ئەوەش سوودێکی وای نییە.

نەنکم وتی، هیچ کام لەو کارانە لە خۆیانەوە بە نرخ نین. کاتێك لە پەنا و نزیکی یەکتر بن وردە وردە واتادار دەبن. پێم وتی، ئەو پرچە دەستکردانە هەندێك جار شتی زۆر جیدی و ناخۆش بۆ جادووگەران دروست دەکەن.

چ شتێکی ناخۆش نەنەگیان؟

ئەو وتی، پرچی دەستکرد پێستی سەری زۆر بە پیسی وەخرو دێنێ. ئاخر، کاتێك ئەکتەرێك پرچی دەستکرد دەکاتە سەری، ئەگەر من یان تۆ ناچار بین پرچی دەستکرد بکەینە سەرمان، ئەوە لەسەر قژی خۆمانی دادەنێین، بەلاّم جادووگەران ناچارن پرچە دەستکردەکە لەسەر پێستە رووتەکەی سەریان دابنێن. بەشی بنەوەی پرچەکە زۆر زبر و ناخۆشە و پێستی سەر بە توندی وەخرو دینێ. جادووگەران ناوّیان لێ ناوە، لیر یان زیبکەی پرچی دەستکرد. ئەو لیر و زیبکانە هەرگیز لەگەلّ خرو بەراورد ناکرێ.

پرسیم، لەسەر چ شتێکی تر دەتوانم جادووگەران دەست نیشان بکەم؟

نەنکم وتی، لەسەر کونی لوتیان. کونە لوتی جادووگەران بلێی نەلێی لە کونە لوتی مرۆڤە ئاسایەکان گەورەترە. کونە لوتیان وەکو بازنە و تۆقی جۆرە قرژاڵێك چرچ و لۆچی تێدایە.

پرسیم، لەبەر چی کونە لوتیان ئەوندە گەورەیە؟

نەنکم وتی، بۆ ئەوەی بتوانن بە باشی بۆن بکەن. جادووگەران هەستی بۆن کردنی لەرادەبەدەریان هەیە. ئەوان دەتوانن لە مەودایەکی دوور و لە ناو جەرگەی شەودا، بۆنی منداڵان بکەن.

وتم ، ئەوان ناتوانن بۆنی من بکەن. تازە خۆم شوشتووە.

نەنکم وتی، بۆچی دەتوانن. تا مرۆڤ خاوێن تر بێ، باشتر دەتوانن بۆنی بکەن.

وتم، خۆ بە جیدیت نییە.

نەنکم وتی، بەراستی بۆنی منداڵی خاوێن بۆ جادووگەران ناخۆش و بۆگەنە. تا مرۆڤ پیستر بێ، کەمتری بۆن دێ.

بەڵام نەنەگیان ئەو قسەیە بێ مانایە.

نەنکم وتی، بۆچی، زۆریش ماناداره. جادووگەران بۆنی پیسی ناکەن. ئەوە ئێمەین بۆنی پیسی دەناسین و دەست نیشانی دەکەین. ئەو شتەی کە جادووگەران هەستیار دەکات، ئەو بۆنەیە کە لە مرۆڤەکانەوە هەستی پێێ دەکەن. ئەو بۆنە لە رێگەی هاتنی باوە لە پێستی مرۆڤەکان دێتە دەر و لە هەوادا بڵاو دەبێتەوە و کاریگەری لەسەر هەردوو کونە لوتی جادووگەرەکە دروست دەکات و سەری پێ هەڵدەسورێنێ.

کەمێك سەبر بگرە نەنەگیان...

ئەو وتی، قسەم پێ مەبڕە. گرنگیەکەی ئەوەیە. کاتێك مرۆڤ هەفتەیەك خۆی نەشوشتبێ، پێستی لەشی بە چەوری و چڵك دادەپۆشرێ و ئاشکرایە کە بۆنە ناخۆشەکەی ئەوەند لە هەوادا بڵاو نابێتەوە.

وتم، لەمەودوا هەرگیز خۆم ناشۆم.

نەنکم وتی، دەبێ ماوەی حەمامەکان کەم کەیەوە. مانگی جارێك حەمام کردن زۆر تەواوە بۆ منداڵان.

لەو جۆرە کاتانەدا نەنکم زیاتر خۆشدەویست.

وتم، نەنەگیان، کاتێك هەوا تاریکە، جادووگەران چۆن بۆنی منداڵان لە گەورەکان جیادەکەنەوە؟

ئەو وتی، لە لەشی گەورەکان بۆنی ناخۆش لە هەوادا بڵاو نابێتەوە، تەنیا منداڵەکان ئەو بۆنەیان لێ دێت.

وتم، بەڵام خۆ لە من بۆنی ناخۆش لەهەوادا بڵاو نابێتەوە. وانییە؟ ئێستا بۆنی ناخۆشم لێ دێت؟

نەنکم وتی، بەڕای من هەرگیز بۆنی ناخۆشت لێ بڵاو نابێتەوە. لای من بۆنی سێو و لیمۆت لێ دێ. بەڵام بۆ جادووگەرێك بە دڵنیاییەوە بۆنی ناخۆش و قێزەونت لێ دێت.

پرسیم، دەبێ چ بۆنێکم لێ بێ؟

نەنکم وتی، بۆن تەرس، بۆنی کشپل.

قیژاندم، خۆ من بۆنی تەرس و کشپلم لێ نایەت! وا نییە! وانییە!

نەنکم بە خۆشی و شادیەکی نادیارەوە وتی، ئەوە هەر هیچ نی یە، بۆ جادووگەران، بۆنی تەرس و کشپلی تازە زۆر باشترە.

هاوارم کرد، ئەو قسانە درۆن! بۆخۆم دەزانم بۆن تەرس و کشپل نادەم، چ تەرسی کۆن چ تەرسی تازە!

نەنکم وتی، پێویست ناکات لەم بارەوە مناقشە بکەین. ئەوە واقیعی ژیانە!

زۆر توڕە بووم. نەمدەتوانی باوەڕ بە قسەکانی نەنکم بکەم.

نەنکم بەردەوام بوو، ئەگەر بینیت ئەو ژنەی لە جادە بە تەنیشتدا دەڕوات لوتی خۆی گرتووە، بزانە ئەگەری زۆری هەیە ئەو ژنە جادووگەر بێت.

بڕیارمدا باسەکە بگۆڕم. وتم، جادووگەران چ نیشانەیەکی تریان هەیە؟

نەنکم وتی، **چاو**، زۆر ئاگاداری چاوەکان بە، چونکە چاوەکانی جادووگەرێکی واقیعی جیاوازی هەیە لەگەڵ چاوەکانی من و تۆ. هەمیشە ئەو بەشەی چاو کە بە شێوەیەکی سروشتی خاڵێکی رەشە، بە باشی لێی ورد بەوە. ئەگەر ئەو کەسە جادووگەر بێ، رەنگی ئەو خاڵە بەردەوام دەگۆڕێ و مرۆڤ لە کۆتایی خاڵەکە دەتوانێ ئاگر و بەفر و سەهۆڵ ببینێ کە لە ناوەراستی خاڵ رەنگیەکە خەریکی سەما کردنن. مرۆڤ بە بینینی ئەو دیمەنە پێستی لەشی دێتە ژان و مچوڕکی پێدا دێ.

نەنکم پاڵی بە کورسیەکەیەوە داو بە ئارامی مژی لە جگەرە رەشەکەی دا. منیش بە سەرسامیەوە لەسەر ئەرزەکە هەڵتوتەکابووم و چاوم تێوە بڕیبوو. ئەو زەردە خەنەی لەسەر لێو نەبوو. سیما و حاڵەتیشی زۆر جیدی بوو.

لێم پرسی، شتی تریش هەیە؟

نەنکم وتی، بەدڵنیاییەوە، وابزانم هێشتا تینەگەیشتووی جادووگەران لە واقیعدا ژن نین. ئەوان لە شێوەی ژنن. وەك ژنان قسە دەکەن و دەتوانن وەك ژنان رەفتار بکەن. بەڵام راستیەکە ئەوەیە ئەوان بە تەواوی شتێکی ترن. ئەوان شەیاتینێکن لە جلی مرۆڤدا. هەر بۆیە ئەوان پەنجەیان هەیە و سەریشیان تاسە، لوتیان نائاساییە و چاوەکانیشیان سەیر و سەمەرە، ئەوان ناچاران هەر چۆنێك بێ ئەو شتانە لە خەڵك بشارنەوە.



نەنە گیان ئیتر چ شتێکی تریان جیاوازە لەگەڵ ئێمە.

ئەو وتی، **لاقیشیان**، لاقەکانی جادووگەر پەنجەیان پێوە نییە.

هاوارم کرد، پەنجەیان نی یە؟ ئەی چییان هەیە؟

نەنکم وتی، هەر قاچیان هەیە، قاچی چوار گۆشە کە هیچ پەنجەیەکیان پێوە نییە.

پرسیم، رۆیشتنیان بۆ ناخۆش و زەحمەت نییە؟

نەنکم وتی، هەرگیز. بەڵام پێڵاو لەپێ کردنیان ئاسان نییە. هەموو خانمێك پێی خۆشە پێڵاوی بچووك و نووك تیژ لەپێ بکات. بەڵام جادووگەران، بەو قاچە پان و چوار گۆشەیان، ناچارن زۆر بە ناخۆشی ئەو پێڵاوە بچووك و نووك تیژانە بکەنە پێیان.

پرسیم، بۆچی پێڵاوی راحەت و نووك پان ناکەنە پێیان؟

نەنكم وتی، ناوێرن، ئەوان هەر وەك تاسی سەریان بە پرچی دەستكرد دەشارنەوە، ناچارن قاچە ناشیرینەكانیشیان لە پێلاوی جوان بئاخنن.

وتم، زۆر ناخۆشە، وەنا؟

نەنكم وتی، زۆر بەڵام هیچ چاریان نییە.

نەنەگیان، كە وابوو من لە پێلاوەكانیشەوە ناتوانم بیانناسم.

نەنكم وتی، پێموانییە بتوانی، بەڵام لەوانەیە لە رۆیشتنەكەیانەوە بتوانی، ئەوان دەشەلن، بەو مەرجەی لە نزیكەوە سەیریان بكەی.

نەنەگیان، هیچ جیاوایەكی تریان لەگەڵ ئێمەدا نییە؟

نەنكم وتی، بۆچی، جیاوازیەكی تریان هەیە.

چ جیاوازییەك، نەنەگیان؟



**ئاوی** زاریان شینه.

هاوارم کرد، شین! چۆن دەبێ؟ لەبەر چی؟

ئەو وتی، شینێکی کاڵ.

نەنەگیان گاڵتە مەکە! ئاوی زاری خۆ شین نابێ!

ئەو وتی، ئاوی زاریان شینە.

پرسیم، واتە وەك مرەکەبە؟

ئەو وتی، رێك وەك مرەکەب. ئەوان تەنانەت بۆ نووسینیش بەکاری دێنن. ئەوان ئەو پێنووسە قەدیمانەی کە سەرەکەیان وەك قەڵەم وایە، بەکار دێنن و نووکەکەشی بە زمانیان رادەکێشن.

نەنەگیان، کەس دەتوانێ ئاوی زاریان ببینێ؟ ئەگەر جادووگەرێك قسەم لەگەڵ بکات، دەتوانم ئاوی زاری ببینم؟

نەنکم وتی، ئەگەر بە وردی سەیری بکەی، بەڵێ. ئەگەر زۆر بە وردی سەیری بکەی، تویخێکی شین لەسەر ددانەکانیان دەبینی، بەڵام زۆر دیار نییە.

وتم، ئەگەر تف بکات، دیار دەبێ.

نەنکم وتی، جادووگەران هەرگیز تفێ فڕێ نادەن. ئەو غیرەتەیان نییە.

بڕوام نەدەکرد نەنکم درۆم لەگەڵدا بکات. ئەو هەموو بەیانیان دەچوو بۆ کەنیسە و هەمیشە پێش نان خواردن دوعای دەکرد. کەسێك ئەو کارانە بکات، درۆ ناکات. لەبەر ئەوە وردە وردە بڕوام بە قسەکانی دەکرد.

نەنکم وتی، ئەویتریش دەکەوێتەوە سەر خۆت. ئەو شتانەی پێویست بوو پێموتی. بەڵام هیچ کام لەوانە بە تەنیا سوودێکی وای نی یە. مرۆڤ هیچ کات بە سەیر کردنی ژنێك ناتوانێ دڵنیا بێ کە ئەوە جادووگەرە، یا نا. بەڵام ئەگەر دەستکێش لەدەست بێ، ئەگەر کونی لوتی گەورە بێ، ئەگەر چاوەکانی سەیر و سەمەر بێ، و ئەگەر

قژەکانی سەری لە شێوەی پرچی دەستکرد بێ و ئەگەر شینایی لەسەر ددانەکانی بینرا، ئەگەر هەموو ئەو شتانەی بە یەکەوە هەبوو، ئەو کات دوو پێت هەیە، دووی تریش قەرز بکە و ڕابکە.

وتم، نەنەگیان، کاتێك بچووك بووی، جادووگەرت بینیبوو؟

نەنکم وتی، جارێك، تەنیا جارێك.

چی روویدا؟

ئەو وتی، پێم خۆش نییە بۆت بگێڕمەوە. چونکە ئەو کات دەترسی و شەوانە خەونی ناخۆش دەبینی.

بە پاڕانەوەوە وتم، تکا دەکەم پێم بڵێ.

ئەو وتی، نا، مرۆڤ هەندێك شت هەرگیز نابێ بگێڕێتەوە.

پرسیم، ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بە پەنجە گەورەکەتەوە هەیە، کە لێ بۆتەوە؟

یەکسەر، لێوە چرچ و لۆچەکانی وەك جووتێك پلایس پێکداکەوت و ئەو دەستەی کە جگەرەکەی گرتبوو (و پەنجە گەرەکەی نەبوو)، کەوتە لەرزین.

چاوەڕوان بووم. ئەو سەیری منی نەدەکرد. هیچیشی نەدەوت. بە تەواوی چوو بوو ناو جیهانێکی تر. قسە کردن تەواو ببوو.

هەستامە سەرپێ و رووومەتم ماچ کرد و وتم، شەو خۆش نەنەگیان.

ئەو لە جێی خۆی نەجوولا. منیش هاتمە دەرێ و چوومەوە ژوورەکەی خۆم.

# جادووگەری مەزن

رۆژی دواتر، پیاوێك کە جلی رەشی لەبەر بوو و جانتایەکیشی بە دەستەوە بوو، هاتە ماڵمان و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە ژووری دانیشتن لەگەڵ نەنکم قسەیان دەکرد. بۆم نەبوو بڕۆمە ژوورەوە، بەڵام دوای رۆیشتنی ئەو پیاوە، نەنکم بە غەمناکیەوە وردە وردە هاتە لام.

ئەو پیاوە وەسیەتنامەی باوکمی هێنابوو.

پرسیم، وەسیەتنامە چی یە؟

وتی، شتێکە پێش مردن دەینووسن و تێیدا دەست نیشانی دەکەن مڵك و ماڵەکەیان بۆ کێ دەبێت. بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە لە ناویدا دەنووسن، ئەگەر دایك و باوك مردن، سەرپەرشتی منداڵەکە دەکەوێتە ئەستۆی چ کەسێك.

ترسێکی لەرادبەدەر کەوتە ناو گیانم. هاوارم کرد، بە دڵنیاییەوە تێیدا نووسراوە کە تۆ سەرپەرشتی من دەبی، مەگەر نا؟ خۆ ناکرێ من بچمە لای کەسێکی تر نەنەگیان؟

ئەو وتی، نا، باوکت ئەو کارەی نەکردووە، باوکت ویستوویەتی تا من زیندووم، ئاگاداری لە تۆ بکەم، بەڵام لە وەسیەتنامەکەدا نووسیویەتی تۆ ببەمەوە بۆ ماڵەکەی خۆت لە بەریتانیا. ئەو ویستوویەتی ئێمە لە وێ بژین.

وتم، بۆچی؟ بۆ چی ناتوانین لە نەرویج بمێنینەوە؟ بۆ خۆت پێتوتم شوێنی ترت پێی خۆش نییە!

ئەو وتی، راستە، بەڵام کێشە و مەسەلەی زۆر سەبارەت بە خانوو و پارە هەیە کە تۆ تێیان ناگەی. لە ناو وەسیەتنامەکەدا نووسراوە هەر چەند خانوادەکەت نەرویجین، بەڵام لە بەریتانیا هاتوویەتە دونیا و هەر لەوێش خوێندنت دەست پێکردووە و دەبێ هەر لەوێش گەورە بی و بەردەوام بی لە خوێندنەکەت.

هاوارم کرد، نەنەگیان، بەڵام تۆ پێت خۆش نییە لە خانوویەکی بەریتانیدا بژی.

ئەو وتی، تۆ راست دەکەی، بەڵام بەداخەوە ناچارین. لە ناو وەسیەتنامەکەدا نووسراوە کە ئەوە ویستی دایکیشت بووە، دەبێ رێز لە خواستی دایك و باوکت بگیرێ.

چارمان نەبوو. دەبوو بچین بۆ بەریتانیا، نەنکم یەکسەر خەریکی ئامادە کردنی شتی سەفەر بوو. کۆرسی تازەی مەکتەب چەند رۆژی تر دەست پێدەکاتەوە، نابێ کاتمان بە فیڕۆ دەیین.

شەوی پێش رۆیشتن بۆ بەریتانیا، نەنکم دووبارە دەستی کردەوە بە گێڕانەوەی بابەتی دڵخوازی. بەریتانیا بە ئەندازەی نەرویج جادووگەری لێ نییە.

وتم، دڵنیام چاوم بە هیچ کامیان ناکەوێ.

بە دڵ پێمخۆشە وا بێ، چونکە لەوانەیە جادووگەرە بەریتانیەکان خراپترین جادووگەرانی دونیا بن.

ئەو دانیشتبوو و جگەرە بۆن ناخۆشەکەی دەکێشا و قسەی دەکرد و منیش سەیری دەستە بێ پەنجەکەیم دەکرد. بەدەست خۆم نەبوو. هەموو هۆشم لەسەر

ئەو پەنجەیە بوو و بەردەوام بیرم دەکردەوە لە کاتی بینینی ئەو جادووگەرە دەبێ چ شتێك روویدابێ بۆ نەنکم. بەدڵنیاییەوە مەسەلەیەکی زۆر ترسناك و ناخۆش بووە، دەنا بۆی دەگێڕامەوە. لەوانەیە پەنجە گەورەکەی بادابێ و هەڵیکەندبێ، لەوانەشە پەنجەی بە زۆر لە لولە کەتری گەرم وکوڵیو ڕاکردبێ تا ببێتە هەڵم، لەوانەشە پەنجەیان وەکو ددان کێشابێ. هەر چەندی دەمکرد نەمدەتوانی ئەو پەنجەیە لە بیر خۆم بەرمەوە.

وتم، نەنەگیان جادووگەرە بەریتانیەکان چی دەکەن؟

ئەو مژێکی لە جگەرە بۆن ناخۆشەکەی داو وتی، جادووی دڵخوازی ئەوان ئەوەیە بە یارمەتی جۆرە بۆدرەیەك، منداڵەکەی دەکەنە بونەوەرێکی تر کە هەموو گەورەکان ڕقیان لێ دەبێتەوە.

چ بوونەوەرێك نەنەگیان؟

ئەو وتی، زۆر جار لول پێچ، لول پێچ گیانلەبەری خۆشەویست و دڵخوازی وانە، چونکە گەورەکان بە بێ ئەوەی بزانن ئەوە منداڵە، پێی لەسەر دادەنێن و پانی دەکەنەوە.



هاوارم کرد، ئەوە زۆر ترسناك و وەحشیانەیە!

نەنکم وتی، یا کێچێك، لەوانەیە کەسەکەی بکەن بە کێچ و دایکی بە بێ ئەوەی بزانێ چی دەکات مێش کوژێکی هەڵبگرێ و منداڵەکەی بکوژێ.

نەنەگیان نیگەرانم دەکەی. نامەوێ بگەڕێمەوە بەریتانیا.

ئەو بەردەوام بوو، من لە بەریتانیا جادووگەری وا دەناسم منداڵان دەکاتە کەڵەشێری کێوی و رۆژێك پێش تەواو بوونی وەرزی راو کردنی کەڵە شێری کێوی لە ناو دارستان بەرەڵایان دەکات.

وتم، وەی، ئەو کات راوچیەکان بە تەور لێیان دەدەن؟

ئەو وتی، بەڵێ. دواتریش پەڕەکانیان لێ دەکەنەوە و بۆ نانی نیوەرۆ سووریان دەکەنەوە.

وام وێنە کرد بوومەتە کەڵە شێری کێوی بە ترس و لەرزەوە لەسەرچەند پیاوی تفەنگ بەدەست باڵان لێ دەدەم و ئەو کاتەی دەبمە نیشانەی تفەنگەکان، بەردەبمەوە خوارێ.

نەنکم وتی، بەڵێ، جادووگەران بەوەی لە گۆشەیەك راوەستن و ببینن گەورەکان بەدەستی خۆیان منداڵەکانیان لەناو دەبەن، خەنی دەبن.



نەنە گیان، هەرگیز پێمخۆش نییە بگەڕێمەوە بەریتانیا.لای‌لار
ئەو وتی، دەزانم، دەزانم. منیش پێمخۆش نییە. بەڵام وابزانم چارەیەکی ترمان نییە.
پرسیم، جادووگەرانی شوێنە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ یەکدا جیاوازیان هەیە؟
نەنکم وتی، بە تەواوی جیاوازن. بەڵام سەبارەت بە وڵاتانی تر هیچ شتێك نازانم.
پرسیم، سەبارەت بە جادووگەرە ئەمریکیەکانیش هیچ نازانی؟
ئەو وەڵامی دایەوە، نا، بەڵام بیستوومە جادووگەرانی ئەوێ توانایان هەیە گەورەکان ناچار بکەن منداڵەکانی خۆیان بخۆن.
هاوارم کرد نا، ئەی نەنە گیان! ئەو قسەیە درۆیە!
ئەو وتی، راست و درۆیەکەی نازانم، تەنیا بیستوومە.
پرسیم، ئاخر چۆن ئەوان منداڵی خۆیان دەخۆن؟
ئەو وتی، دەیانکەنە سۆسیس، ئەو کارە بۆ جادووگەرێکی شارەزا وەك ئاو خواردنەوە وایە.
پرسیم، هەموو وڵاتەکان جادووگەری تایبەت بە خۆیان هەیە؟
نەنکم وتی، هەر شوێنێك خەڵکی لێ بێت، جادووگەریش هەیە. هەموو وڵاتان ئەنجومەنێکی شاراوەی جادووگەرانیان هەیە.
نەنەگیان، ئەوان هەموو یەکتر دەناسن؟
ئەو وتی، پێموانییە. هەر جادووگەرێك تەنیا جادووگەری وڵاتی خۆی دەناسێ. ئەوان بۆیان نییە پەیوەندی لەگەڵ جادووگەرانی دەرەوە بکەن. بەڵام، بۆ نموونە جادووگەرێکی بەریتانی هەموو جادووگەرانی بەریتانیا دەناسێ. ئەوان بە یەکەوە دۆستن. تەلەفۆن بۆ یەکتر دەکەن، کارە ترسناك و مەرگ هێنەکان لەگەڵ یەکتر دەگۆڕنەوە و خوا دەزانێ لەگەڵ یەکتر باسی چی دەکەن. تەنانەت بیرکردنەوەشی حاڵم تێکدەدا.

من لەسەر عەردی دانیشتبووم و سەیری نەنکم دەکرد. ئەو قونچکە جگەرەکەی لە ناو تەپڵەکەکە هاویشت و دەستەکانی لەسەر سکی دانا. هەموو ساڵێ جادووگەرانی هەر وڵاتێك کۆبوونەوەیەکی نهێنی دەبەستن. ئەوان لە شوێنێك کۆدەبنەوە تا گوێ لە وتاری جادووگەری مەزنی سەراسەری جیهان بگرن.

هاوارم کرد، وتاری کێ؟

نەنکم وتی، جادووگەری مەزن، ئەو فەرمانڕەوای جادووگەرانە و زۆر بە توانایە. بەڕاستی بێ بەزەییە. هەموو جادووگەرانی جیهان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەون. ساڵی جارێك لە کۆبوونەوەی ساڵانەدا دەیبینن. ئەو دەچێتە ئەو شوێنە بۆ ئەوەی هەست و سۆز لە دەروونی جادووگەران پاك بکاتەوە و فەرمانی نوێ دەربکات. جادووگەری مەزن بۆ پێکهێنانی ئەو کۆبوونەوەیە سەردانی هەموو وڵاتان دەکات.

نەنەگیان، ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە لە کوێ ئەنجام دەدەن؟

نەنکم وەڵامی دایەوە، وادەنگۆیە. بیستوومە ئەوان وەك هەموو گروپەکانی ژنان لە کاتی کۆبوونەوە لە یەکێك لە ئوتێلەکان جێگەی دەگرن. بیستوومە لەو ئوتێلانەدا شتی سەیرو سەمەر روودەدا. دەڵێن لە ناو پێخەفی ئەو ئوتێلانەدا کەس ناخەوێ، دەڵێن مافوری ژوورەکانیان شوێنی سوتانیان پێوە دیار بووە، دەڵێن لە ناو وانی حەمامەکانیان بۆق بینراوە، جارێکیان چێشتلێنەری یەکێك لەو ئوتێلانە بەچکە تیمساحێکی لە ناو مەنجەڵی سوپەکەدا دۆزیەوەتەوە.

نەنکم جگەرەکەی هەڵگرت و مژێکی تری لێدا و دوکەڵەکەشی بە تامەزرۆییەوە رەوانەی سیەکانی کرد.



پرسیم، جادووگەری مەزن لە کوێی وڵاتەکەیدا دەژی؟

نەنکم وتی، کەس نازانێ. ئەگەر ئەوەمان نزانیبا، ئەو کات بە یەگجاری لە ناومان دەبرد. جادووگەرناسانی تەواوی دونیا هەموو هەوڵەکانیان ئەوەیە سەرکردایەتی نهێنی جادووگەری مەزن بدۆزنەوە.

نەنەگیان، جادووگەرناس مانای چییە؟

نەنکم وتی، جادووگەرناس ئەو کەسەیە شتی زۆر لەمەڕ جادووگەران دەخوێنێتەوە و زانیاری زۆری لەبارەیانەوە هەیە.

تۆ یەك جادووگەرناسی نەنەگیان؟

ئەو وتی، من جادووگەرناسێکی خانەنشینم. ئیتر بۆ کار و چالاکی پیر بووم. هەموو شوێنێکی سەر گۆی زەوی گەڕاوم تا شوێن پێیەکی جادووگەری مەزن بدۆزمەوە، بەڵام هیچم دەست نەکەوت.

پرسیم، ئەو دەوڵەمەندە؟

نەنکم وتی، لە ناو پارەدا مەلەی دەکات. بە پێی ئەو دەنگۆیانەی هەیە، سەرکردایەتیەکەی ئامێرێکی لێیە لە ئامێری چاپکردنی پارە دەچێ. پارە تەنیا پارچە کاغەزێکە و شتێکی تایبەتی لەسەر چاپ کراوە. هەر کەسێك کاغەز و ئامێرەکەی هەبێت، دەتوانێ پارە چاپ بکات. جادووگەری مەزن هەر چەندنێکی پێی خۆش بێ پارە لە چاپ دەدات و لە نیوان جادووگەراندا دابەشی دەکات.

پرسیم، دراوی دەرەکی چییە؟

نەنکم وتی، ئەو ئامێرانە هەتا دراوی چینیش لە چاپ دەدەن، تەنیا نەخشەکەی بدەینێ و دەست لەسەر دوگمە تایبەتیەکەی دابنێین.

وتم، ئەگەر تا ئێستا هیچ کەس جادووگەری مەزنی نەبینیوە، ئەدی بۆ ئەوەندە دڵنیای کە ئەو بوونی هەیە؟

نەنکم بە جیدی سەیرێکی کردم و وتی، تا ئێستا هیچ کەس شەیتانی نەبینیوە، بەڵام هەمووش دەزانن کە بوونی هەیە.

بەیانی رۆژی دواتر بە کەشتی رۆیشتین بۆ بەریتانیا و گەڕامەوە بۆ خانووە قەدیمیەکەمان لە شاری کێنت، بەڵام ئەو جارەیان تەنیا لەگەڵ نەنکم، کە قەرار بوو ئاگاداریم بکات. دواتر کۆرسی زستانەم دەستی پێکرد و منیش هەموو رۆژی هەفتە دەچوومەوە مەکتەب، و وادیار بوو هەموو شتێك ئاسایی بۆتەوە. کۆتایی باغەکەمان درەختێکی گەورە و ئەستووری تەورێزی لێ بوو، **من و تیمی** (باشترین برادەرم) لەسەر بڵندترین لقەکانی ئەو دارە خەریکی دروستکردنی خانوویەکی

درەختی بەشکۆ بووین. تەنیا لە پشووی کۆتایی هەفتە دەمانتوانی دەستێکی پێدا بێنین. بەڵام کارەکەمان بە باشی بەرێوە دەچوو.

یەکەم شت لە نێوان دوو لقی لێك دوور چەند تەختەمان دانا و بە بزمار بە لقکەمانەوە داکوتا و ئەوەش بوو بە کەفی (سەر عەردی) خانووەکە. ئەو کارەمان مانگێکی خایاند. دواتر مەحەجەرەیەکمان بە دار بە دەوری کەفەکەدا دروست کرد. تەنیا سەقفەکەی مابوو. دروستکردنی سەقفەکەی کەمێك قورس بوو.

بەیانییەکی رۆژی شەممە کە **تیمی** بە هۆی نەخۆشیەوە کەوتبوو ناو جێگە، بڕیارمدا بۆ خۆم سەقفی خانووەکە دروست بکەم. لەو سەرەوە لەسەر بڵندترین لقی درەختە تەورێزیەکە، کە دەوروبەرەم پڕ بوو لە گەڵای جوان و ناسك، زۆر خۆش بوو چێژم لێ وەردەگرت. هەستم دەکرد لە ناو ئەشکەوتێکی گەورە و سەوزدام. بەرزایی درەختەکە مەسەلەکەی گەورەتر دەکرد. نەنکم پێیوتبووم ئەگەر لەسەر درەخت بەربیمەوە، لاقم دەشکێ، منیش هەر جارەی لەو سەرەوە، سەیری خوارەوەم دەکرد، تیرەغەی پشتم مچوڕکی دەدا.

یەکەم تەختەی سەقفەکەم بە بزمار لە مەحەجەرەکەدا. دواتر، لەناکاو بە گۆشەی چاوم دیتم ژنێك لە بن درەختەکە راوەستاوە. ئەو تەماشای سەرەوەی دەکرد و زەردەخەنەیەکی زۆر سەیری لەسەر لێوان بوو.

زۆربەی خەڵکی لە کاتی پێکەنیندا لێوەکانیان بەملاو ئەولادا دەکشێن. بەڵام لێوەکانی ئەو ژنە بۆ سەرو خوارێ چوو بوون و تەواوی ددانەکانی پێشەوە و پوکەکانی نیشان دەدا. پوکەکانی وەك گۆشتی کاڵ بوو.

هەمیشە مرۆڤ کە بیر دەکاتەوە بە تەنیایە، ئەگەر بزانێ سەیری دەکەن، پێی ناخۆش دەبێ. ئەو ژنە نەناسراوە لە باغی ئێمەدا چی دەکات؟ زانیم کە ئەو کلاوێکی بچووك و رەشی لەسەر کردووە و دەستکێشێکی رەشیشی لە دەست دایە کە تا ئەنیشکی دێت.

دەستکێش! ئەو دەستکێشی لەدەست بوو.

هەموو گیانم سڕ بووە.

ئەو ژنە چاوی لەسەر هەڵنەدەگرتم، هەر بە هەمان زەردخەنە کە ددان و پوکەکانی نیشان دەدا، پێیوتم، دیاریەکم بۆ هێناوی.



وەڵامیم نەدایەوە.

ئەو وتی، کوڕە بچکۆلانە لەو درەختە وەرە خوارێ، شتێکت بدەمێ تا ئێستا نەتبینیوە. دەنگی زۆر سەیر بوو. لە دەنگی لێکدانی دوو فلز دەچوو، وەك ئەوەی گەروی پڕ بێ لە پۆنیس.



دواتر بێ ئەوەی چاوم لەسەر هەڵبگرێ، دەستێکی لە باخەڵی ڕاکرد و مارێکی ورد و سەوزی دەرهێنا و لە پێش چاومی ڕاگرت.

پێیوتم، مارێکی بێ ئازارە.

مارەکە خۆی لە بازۆڵەی ئالاند. ڕەنگێکی سەیری هەبوو، وەك زمۆڕەد بوو.

دواتر وتی، ئەگەر بێیە خوارێ، دەدیدەم بە تۆ.

لە دڵی خۆمدا وتم، نەنەگیان، نەنەگیان، یارمەتیم بدە! زۆر ترسابووم. چەکوشەکەم هەڵدایە خوارەوە و وەك مەیمون لەو درەختە گەورە ڕۆیشتمە سەرێ. تا ئەو شوێنەی توانیم سەر کەوتم و هەر لەوێش مامەوە. هەموو گیانم وەك بی

دەلەرزی. ئیتر نەمدەتوانی ئەو ژنە ببینم. گەڵا زۆرەکان من و ئەو ژنەیان لێك بزر کرد.

چەند کاتژمێر بێ ئەوەی هیچ جوڵەیەك بکەم، لەوێ مامەوە. وردە وردە دونیا تاریك دەبوو. لە کۆتاییدا، گوێم لە دەنگی نەنکم بوو کە بانگی دەکردم.

بە دەنگێکی بەرزەوە وتم، من لەو سەرەوەم.

ئەو بانگی کرد، خێرا وەرە خوارەوە، خواردنەکەت سارد بۆوە.

هاوارم کرد، نەنەگیان ئەو ژنە رۆیشتووە؟

نەنکم وتی، کام ژنە؟

ئەو ژنەی کە دەستکێشی رەشی لەدەست دابوو!

لە خوارەوە بێدەنگیەکی تەواو باڵی کێشابوو، بێدەنگی کەسێك کە تووشی ترس و سەرسوڕمان بوو بێت. دووبارە هاوارم کرد، نەنەگیان! رۆیشتووە یا نا؟

لە کۆتاییدا نەنەکم وەڵامی دایەوە، بەڵێ، رۆیشتووە. مەترسە ئازیزم! من



لێرە لە لای تۆم. ڕێگە نادەم کەس ئازارت پێبگەیەنێ. ئێستا وەرە خوارەوە.

لە درەختەکە هاتمە خوارەوە. وەك بی هەڵدەلەرزیم. نەنکم لە باوەشی گرتم. وتم" **من یەك جادووگەرم بینی**".

ئەو وتی، وەرە بڕۆینە ژووریّ، من لە لاتم.

منی بردە ژوورەوە و کوپێکی کەکاوی گەرم و زۆر شیرین پێدام. ئێستا بۆم بگێڕەوە بزانم چی بووە.

هەموو شتەکەم بۆ گێڕایەوە.

دوای تەواو بوونی قسەکانم، نۆبەی نەنکم بوو وەك بی هەڵلەرزێ. ڕەنگی شین هەڵگەڕابوو و چاوی لەو دەستەی پەنجە گەورەکەی پێوە نەمابوو هەڵنەدەگرت. ئەو وتی، دەزانی ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ مانای ئەوەیە یەکێك لەوان لەو دەوروبەرەیە. لەمەو دوا ڕێگە نادەم بە تەنیا بڕۆی بۆ مەکتەب.

پرسیم، پێتوایە ئەو بە تایبەتی بە دوای منەوەیە؟

ئەو وتی، نا، پێموا نییە. بۆ ئەو بوونەوەرانە هەموو منداڵەکان وەکو یەکن.

جێی سەرسوڕمان نییە لەمەو دوا من ببووم بە منداڵێکی جادوو لێکراو. ئەگەر بەڕێکەوت بە تەنیا لە ناو شەقام بام و ژنێکی دەستکێش لەدەستم لێ نزیك بایەوە، وەك گوللە دەردەپەڕیمە لایەکی تری شەقام. و چونکە ئەو مانگە، هەوا زۆر سارد بوو و تارادەیەك هەموو کەس دەستکێشی دەکردە دەستی. لە هەمووش سەیرتر ئەوەیە کە من ئیتر ئەو ژنە مار بە دەستەم نەبینیەوە.

ئەوە یەکەم چاوپێکەوتنی من بوو لەگەڵ جادووگەران. بەڵام دوایین چاوپێکەوتنیش نەبوو.

# پشووی هاوین

پشووی جەژنی کریسمەس هات و رۆیشت و نیوەی دووەمی ساڵی خوێندن دەستی پێکرد.

من و نەنکم پلانمان دانابوو تا پشووی هاوین لە نەرویج بەسەر بەرین. شەوانە تارادەیەك لەبارەی ئەو شتانەدا قسەمان دەکرد. ئەو بۆ من و خۆی کابینێکی لە یەکەم کەشتی کە دوای تەواو بوونی مەکتەب لە نیوکاسێلەوە دەرۆیشت بۆ ئۆسلۆ، پێشوەخت گرت و دەیەویست لە وێوە بمباتە نزیك **ئێرێنداڵ** کە بۆ خۆی هەشتا ساڵ لەمەو پێش بە منداڵی لە پشووی هاویندا دەچوو بۆ ئەوەێ.

ئەو دەیوت، رۆژانە من و برایەکەم لە ناو بەلەمێکی سەلّپ لێدان بووین. کەناراوەکانی پڕە لە دورگەی بچووك، کەسیشیان تێدا ناژی. ئێمە ئەو دورگانەمان دەدۆزیەوە و لەسەر گاشە بەردە جوان و لوسەکانی خۆمان هەڵدەدایە ناو ئاوەکە و هەندێك جار کاتی گەڕانەوە لەنگرمان داویشت تا ماسی تۆن و ساردین بگرین و ئەگەر شتیکیش دەهاتە ناو تۆڕەکەمان، لە ناو دورگەکەدا

ئاگرمان دەکردەوە و ماسیەکەمان لە ناو تاوەدا بۆ نانی نیوەڕۆ سوور دەکردەوە. لە جیهاندا هیچ ماسییەك بە قەدەر ماسی ساردین بە تام و خۆش نییە.

نەنەگیان، چیت بە سەری داوەکەوە دەکرد؟

ئەو وتی، لە سەدەفی خۆراکی، لە نەرویج هەموو بۆ داوەکانیان ئەو سەدەفانە بەکار دێنن و ئەگەر ماسیمان راو نەکردبایە، ئەو سەدەفانەمان لە ناو تاوەدا دەکولاند و دەمانخواردن.

چ تامێکیان هەبوو؟

ئەو وتی، زۆر بەتام بوون. ئەگەر بە ئاوی دەریا بیانکولێنی زۆر تورت و بەتام دەبن.

نەنەگیان ئیتر چیت دەکرد؟

خەریکی سەڵپ لێدان دەبووین و دەستمان بۆ ئەو بەلەمانەی مەیگۆیان راو دەکرد رادەوەشاند، ئەوانیش رادەوەستان و مشتێکی پڕیان مەیگۆ دەداینێ. مەیگۆیەکان هێشتا هەر گەرم بوون چونکە تازە لێندرابوون، ئێمەش لە ناو بەلەمەکەدا دادەنیشتین و پێستەکەمان لێ دەکردنەوە و دەمانخواردن. باشترین بەشی مەیگۆ سەرەکەیەتی.

وتم، سەر؟

ئەو وتی، دەبێ سەرەکەی بە ددانانت بگری و ناوەکەی هەڵمژی. لەرادەبەدەرە. کوڕی ئازیزم، من و تۆ هاوینی ئەمساڵ هەموو ئەو کارانە ئەنجام دەدەین.

وتم، نەنەگیان، ناتوانم تا هاوین سەبر بکەم. پێمخۆشە زوو مەکتەب تەواو بێت.

ئەو وتی، منیش ناتوانم تا هاوین سەبر بکەم.

سێ هەفتە زیاتر تا کۆتایی کۆرسەکە نەمابوو کە رووداوێکی ترسناك روویدا. نەنکم تووشی کۆخە و هەڵامەت ببوو. حاڵی زۆر خراپ بوو و پەرستارێك بۆ چاودێری کردنی هاتە ماڵەوەمان. دکتۆر بۆی روونکردمەوە ئێستاکە بە هۆی

بوونی پنی سیلین، هەلاّمەت نەخۆشیەکی ئەوەندەمەترسیدار نییە، بەلاّم بۆ کەسانی پیر و پەککەوتەی وەك نەنکم بەڕاستی مەترسیدارە. ئەو وتی، لەم هەلومەرجەدا ناوێرێ بیباتە نەخۆشخانە، لەبەر ئەوە لە ناو ژوورەکەیدا خەواندی. کاتێك بتلّی ئۆکسیجین و شتە ترسێنەرەکانی تریان بۆ دەبردە ژوورەوە، من لەدەرەوە چاوەڕوان بووم.

لە پەرستارەکەم پرسی، دەتوانم برۆمە ژوورەوە و بیبینم؟

پەرستار وتی، نا، ئازیزم، دەبێ کەمێك سەبر بگری.

خانمێکی قەلّە و رووخۆش بە ناوی خانمی **سپرینگ** کە بۆ خاوێنکردنەوەی مالّەکە دەهات، گواستبوویەوە مالّی ئێمە و شەوانە لەوێ دەخەوت. خانمی سپرینگ ئاگاداری لە من دەکرد و خواردنی بۆ ئامادە دەکردم. زۆرم خۆش دەویست. بەلاّم لە گێڕانەوی چیرۆك نەدەگەیشتە پەنجە بچووکەکەی نەنکم.

شەوێك، نزیکەی دە رۆژ دواتر، دکتۆر لە قادرمەکان هاتە خوارەوە و پێیوتم، ئێستا دەتوانی برۆیە ژوورەوە و بیبینی، بەلاّم تەنیا چەند چرکەیەك، داوای تۆ دەکات.

خۆم هەلّدایە سەر قادرمەکان و دەرگای ژووری نەنکمم لێ کردەوە و خۆم هاویشتە ناو باوەشی.

پەرستار وتی، ئەوە چی دەکەی ئاگادار بە.

پرسیم، نەنەگیان حالّت باش بووە؟

ئەو وتی، مەترسی نەماوە، لەو رۆژانەدا لە جێیەکەم دێمە دەر.

بە پەرستارەکەم وت، راست دەکات؟

پەرستار بە پێکەنینەوە وتی، بەلّێ، دەلّێ دەبێ چاك بێتەوە تا بتوانێ ئاگاداری تۆ بکات.

دووبارە باوەشم لە نەنکم دا.

ئەو وتی، ئەوانە رێگە نادەن جگەرە بکێشم، دەبێ سەبر بکەین تا دەڕۆن.

پەرستار وتی، چ باڵندەیەکی پیر و گیان سەختە. هەفتەیەکی تر ئیزنت دەدەیین.

پەرستار راستی دەوت. لە ماوەی یەك هەفتەدا، دەنگی تەپە تەپی هەنگاوەکانی نەنکم بە گۆچانە دەسك زێڕەکەیەوە لە ناو ماڵەوەدا بڵاو بۆوە و ئیتر نەیهێشت خانمی سپرینگ خواردنمان بۆ ئامادە بکات. خانمی سپرینگ زۆر سوپاس بۆ یارمەتیەکەت، ئێستا دەتوانی بڕۆی.

خانمی سپرینگ وتی، وەی نا، ناتوانم برۆم. دکتۆر پێی وتووم رێگە نەدەم تا چەند رۆژ زەخت لە خۆت بکەی یان خۆت ماندوو بکەی.

دکتۆر زۆر شتی تریشی وت. ئەو بە من و نەنکمی وت بە هیچ جۆرێك نابێ خۆ لە مەترسی هاوێن و هاوینێ برۆین بۆ نەرویج. ئەو قسەیە بۆ من زۆر کت و پڕ و لە ناکاو بو.

نەنکم هاواری کرد، ئەو شتە بێ مانایایە چییە! بەڵێنم پێداوە بیبەم بۆ نەرویج.

دکتۆر وتی، نەرویج زۆر دوورە، و مەترسیدارە. بزانە دەڵێم چی، لە جیاتان دەستی نەوەکەت بگرە و بڕۆن بۆ ئوتێلێکی خۆش و جوان لە کەنارەکانی باشوری بەریتانیا.

من وتم، نەخێر!

دکتۆر لێی پرسیم، پێت خۆشە نەنکت لە ناو بچێ؟

وتم، بە هیچ جۆرێك.

ئەگەر وایە ئەو ساڵ هاوێنێ سەفەری دوور و درێژ مەکەن. ئەو هێشتاش زۆر بێ هێز و لاوازە. چیتر مەهێڵە ئەو جگەرە رەش و ناشیرنانە بکێشێ.

لە کۆتاییدا، دکتۆر قسەی خۆی سەبارەت بە سەفەرەکە بردە سەر. بەڵام مەسەلەی جگەرەکە لە توانای ئەودا نەبوو.



دوو ژوورمان لە ئوتێلە بە شکۆیەکەی شارە کەنارەیی و بە ناوبانگی **بۆرن ماوث** بۆ گیرا.

نەنکم دەیوت، **بۆرن ماوث** پڕە لە خەڵکی پیری وەك خۆی. هەزاران هەزار کەس دەخۆن و دەخەون چونکە هەوای خۆش و سازگاری ئەوێ، ئەوانی خۆشحاڵ و دڵ زیندوو کردووە و بڕوایان بەوە کردووە تەمەنیان درێژ دەبێ و چەند ساڵ زیاتر دەژین.

لە نەنکمم پرسی، بەڕاستی وایە؟

ئەو وتی، نا گیانەکەم، ئەوە قسەیەکی پوچ و بێ نرخە. بەڵام وابزانم بۆ جارێکیش بێ، ناچارین بە قسەی دکتۆر بکەین.

کەمێك دواتر، من و نەنکم ڕۆیشتین بۆ **بۆرن ماوث** و لە ئۆتێلە شکۆمەندەکە جێگیر بووین، بینایەکی زەبەلاح و سپی بەرامبەر دەریا کە بەڕای من زۆر شوێنێکی ناخۆش دەهاتە بەرچاو بۆ بەسەر بردنی پشووی هاوین. ژوورێکی بە جیام هەبوو، و بە ڕێگەیەکەوە دەچوو بۆ ژووری نەنکم، ناچار نەبووین بۆ بینینی یەکتر بە ڕاڕەوەکەدا بڕۆین.

پێش ئەوەی بڕۆین بۆ **بۆرن ماوث،** نەنکم بۆ دڵخۆش کردنم، دوو مشکی سپی و قەفەزێکی پێدام و منیش ئەوانم لەگەڵ خۆم برد. ئەو مشکانە زۆر شەیتان بوون. ناوی ئەوانم کردە **مێری** و **ویلیام** و هەر کە گەیشتینە ئوتێلەکە چەند شتی

خۆشم فێر کردن. فێرم کردبوون بچنە ناو قۆڵی چاکەتەکەم، لە یەخەکەم بێنەوە دەرو برۆنە سەر سەرم. لەسەر سەرم هەندێکم وردە کێك دادەنا تا بچن بۆ لای.

بەیانی یەکەم رۆژ، خزمەتکارە ژنەکە خەرێکی رێك کردنی جێگاکەم بوو کە یەکێك لە مشکەکان سەری لە بن سەرچەفەکە هێنایە دەر. ژنە خزمەتکارەکە وهای قیژاند کە هەموو لە ژوورەکانیان دەرپەڕین تا بزانن کێ مردووە. ناوی منیان دا بە بەڕێوەبەری ئوتێلەکە. کۆبوونەوەیەك کە دیمەنێکی زۆر ناخۆشی هەبوو، لەگەڵ بەڕێوەبەری ئوتیلەکە و من و نەنکم لە ژووری بەڕێوەبەر بەسترا.

بەڕێوەبەری ئوتیلەکە ناوی بەرێز **سترێنجێر** بوو. پیاوێك بە قژە قیت و درێژیەکانیەوە کە چاکەتێکی کلك داری لەبەر بوو. ئەو بە نەنکمی وت، خاتون، رێگە نادەم مشك بێتە ناو ئوتێلەکەم.

نەنکم قیژاندی، چۆن دەوێری ئەو قسەیە بکەی، ئوتێلەکەتان پڕە لە مشك!

دەموچاوی بەرێز **سترێنجێر** سوور هەڵگەڕاو هاواری کرد مشك! ئەو ئوتێلە یەك مشکیشی لێ نییە!

نەنکم وتی، بۆ خۆم ئەورۆ بەیانی لە ڕاڕەوەکە بینیم مشکێك هەڵدێ بۆ لای چێشتخانە! بەرێز **سترێنجێر** هاواری کرد، ئەو قسەیە درۆیە!



ئەنکم وتی، وا باشە پێش ئەوەی بە کاربەدەستانی تەندروستی گشتی ڕاگەیەنم، تەڵە مشکێکی لێرە دانێن. دوور نییە هەر ئێستاکە مشکەکان لە ژووری چێشتخانەکە ریزیان بەستبێ و ڕێپێوانی سەربازی ئەنجام بدەن یان لە ناو قەفەزەکان و مەنجەڵی سوپ خۆیان حەشار دابێ.

بەڕێز **سترێنجێر** هاواری کرد، ئەو شتە مەحاڵە!

ئەنکم بێ وچان بەردەوام بوو، لەوانەیە نانەکانی ئەورۆ بەیانیش مشکاوی بوو بێ، بۆیە بۆنی گومشکی لێ دەهات. ئەگەر ئاگادار نەبی لە تەندروستی گشتییەوە فەرمانی داخستنی ئوتێلەکە دەدەن، پێش ئەوەی ئەو خەڵکە تووشی نەخۆشی تاعون بن.

بەڕێز سترێنجێر وتی، خاتون، پێدەچێ ئێوە گاڵتە بکەن.

نەنکم وتی، من هەرگیز لەگەڵ ئێوە گاڵتە ناکەم، زۆریش بە جیدی قسە دەکەم. ئێستا رێگە دەدەی نەوەکەی من مشکە سپیەکانی لە ناو ئوتێلەکەدا رابگرێ یا نا؟

بەڕێوەبەری ئوتیلەکە تێگەیشت کە دەرەقەتی نایەت بە نەنکمی وت، خاتون رێگە دەدەن پێشنیارێکتان پێی بکەم؟ بەو مەرجە رێگە دەدەم، مشکەکان هەمیشە لە ناو قەفەزدا بن. پێت باشە؟

نەنکم وتی، پێشنیارێکی زۆر باشە. و دواتر هەستاو لە ژوورەکەی رۆیشتە دەر و منیش بە دوایدا.

کەس ناتوانێ لە ناو قەفەزدا شت فێری مشکەکان بکات. لەگەڵ ئەوەشدا زاتم نەبوو لە قەفەزەکەیان دەربێنم، چونکە ژنە خزمەتکارەکە چاوی هەر بە دوای ئێمەوە بوو. ئەو کلیلی ژوورەکەمی پێبوو هەر کاتژمێرەی جارێك بە بێ هۆ دەهاتە ژووری تا لەگەڵ مشکەکان لە گێرم هاوێت. پێیوتبووم ئەگەر مشکەکان لە یاسا لادەن، کرێکاری ئوتێلەکە لە ناو سەتلێك ئاودا دەیانخینکێنێ.

لەبەر ئەوە بڕیارمدا شوێنێکی ئەمن بۆ فێرکردنی مشکەکانم پەیدا بکەم.

بەدڵنیاییەوە لە ناو ئوتێلێکی ئەوها گەورە ژوورێکی بەتاڵ هەر دەست دەکەوێ. مشکەکانم لە ناو باخەڵی پانتۆڵەکەم هاویشتن و بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی ئەمن لە نهۆمی خوارەوە بەرێکەوتم.

دەوراندەوری نهۆمی قۆرت و پێچ و خوارەوەی ئوتێلەکە پڕ بوو لە ژوورە گشتییەکان کە ناوی هەر یەکەیان بە پیتی زێرین لەسەر دەرگاکان نووسرابوو. بۆ لای ژوورەکانی پشوودان، و جگەرەکێشان، و گەمە کردن، و خوێندنەوە، و وێنە کێشان، بەرێکەوتم. هیچکامیان بەتاڵ نەبوون. لە ڕاڕەوە دوورو درێژەکەی ئوتێلەکە هاتمە خوارەێ و لە کۆتاییەکەیدا گەیشتمە ژووری مۆسیقا. ئەو ژوورە

دەرگایەکی دوو لای هەبوو و لە پێشەوەی تابلۆیەك لەسەر یەك پایە دانرابوو، لەسەری نووسرابوو:

کۆبوونەوەی ج س ج س ك
هاتنە ژوورەوە قەدەغەیە
ئەو ژوورە بۆ
کۆبوونەوەی ساڵانەی
کۆمەڵەی پاشایەتی
پێشگیری لە
ستەم کردن لە منداڵان
گیراوە.

هەردوو دەرگای ژوورەکە کراوە بوو. بە دزی سەیری ژوورەوەم کرد. ژوورەکە لەرادەبەدەر گەورە بوو. لە ناو ژوورەکە بەرامبەر بە سەکۆ، ریز بە ریز کورسیان دانابوون.

ڕەنگی کورسیەکان زێڕی بوو و لەسەر شوێنی دانیشتنەکەیان هەر یەکە و دۆشەکەڵەیەکی بچووکی سووریان دانابوو. بەڵام ژوورەکە کەسی لێ نەبوو.

بە ترسەوە تەنیشتا و تەنیشت چوومە ژوورێ. شوێنێکی خۆشاردنەوەی سەیر بوو. لەبەر خۆمەوە وتم، لە وانەیە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی پاشایەتی پێشگیری لە ستەم کردن لە منداڵان بەیانی زوو بەستراوە و ئێستاش ئەندامەکان ڕۆیشتوونەوە ماڵێ. یا هێشتا نەڕۆیشتبنەوە، یان لەناکاو خۆ بە ژووریدا بکەن، بەدڵنیاییەوە ئەوەندە میهرەبانن کە کاریان بە کاری فێرکارێکی گەنج کە خەریکی فێرکردنی مشکێکە، نەبێ.

لەو سەرەوەی ژوورەکە پەردەیەکی چیندار هەڵواسرابوو، و ئەژدیهایەکی سەوزی لەسەر کێشرابۆوە. من، تەنیا بۆ دوور کەوتنەوە لە مەترسی، بڕیارمدا ڕێنوێنیەکانم لە پشت پەردە ئەنجام بدەم. ئەندامانی کۆمەڵەی پێشگیری لە ستەم کردن لە منداڵان جێی مەترسی نەبوون، بەڵام لەوانە بوو هەر دم بەڕێوەبەری ئوتێلەکە، بەڕێز سترێنجێر سەری لە ژوورێ ڕابکات. ئەگەر شتێکی وا ڕوویدابا و مشکە قوڕبەسەرەکانی بینیبا، پێش ئەوەی بتوانم هیچ بڵێم، یەکسەر بۆ ناو سەتڵی کرێکاری ئوتێلەکە بەڕێ دەکران.

ئارام ئارام و بە دزی چوومە ئەو سەری ژوورەکە و لە پشت پەردە گەورەکە و لەسەر فەرشە سەوز و ئەستورەکە دانیشتم. بەڕاستی جێگایەکی خۆش و نایاب بوو! ویلیام و مێریم لە باخەڵی پانتۆڵەکەم دەرهێنا. ئەوان بە ئاقڵی و بە بێ دەنگی لەسەر زەوی لە تەنیشت من دانیشتن.

ئەو شتەی بە تەما بووم لەو ڕۆژەکەدا فێریان بکەم، ڕۆیشتن لەسەر تەناف بوو. ئەگەر بە باشی بزانن، بە تەمای چین و دەتانەوێ چی بکەن، فێرکردنی ڕۆیشتن بە شارەزایەکی زۆرەوە بە مشکێکی زیرەك و ئازا زۆر قورس و ناخۆش نییە. پێش هەموو

شتێك پارچە داوێكتان پێویستە. من ئەو داوەم هەبوو. دواتر دەبێ هەندێك كێكت پێی بێ. كێكی خۆش و بەتامی كشمیش، خواردنی دڵخوازی مشكە سپیەكانە.

ئەوان نەماوی كێكن. من پارچە كێكێكی رەقی وەك بەردم هەبوو كە لە ئێوارەی رۆژی پێشترەوە هەڵم گرتبوو.

ئێستاكە دەتوانن دەست پێبكەن. داوەكە لە نێوان هەر دوو دەستتاندا رابگرن. داوەكە دەبێ زۆر كورت بێ، نزیكەی پێنج شەش سانتیم. مشكەكەی لەسەر دەستی راستتان دابنێن و پارچە كێكەكەش لەسەر دەستی چەپتان. بەم شێوەیە دووری مشكەكە لە پێنج شەش سانتیم زیاتر نابێ. ئەو كێكەكەی دەبینێ و بۆنی دەكات. سمێڵەكانی لەبەر خۆشیان ساف و درێژ دەبێ. ئەگەر خۆی كەمێك راكێشێتە پێشەوە، دەتوانێ بگاتە كێكەكە، بەڵام بە تەواوی نا. تەنیا دوو هەنگاوی دەوێ تا بگاتە ئەو پاروە بەتام و خۆشە. دواتر غیرەتی دەداتە بەر خۆی و یەكەم جار لاقێكی دەباتە پێش و دواتر لاقەكەی تری. ئەگەر مشكەكە بتوانێ هاوسەنگی خۆی رابگرێ، كە زۆربەی مشكەكان ئەو توانایەیان هەیە، بە ئاسانی دەگاتە لایەكی تر. یەكەم جار ویلیامم لەسەر دەستی دانا. ئەو بە بێ وەستان لەسەر داوەكە رۆیشت. رێگەم پێدا دەستێك بگەیەنێتە كێكەكە تا ئیشتیای بجووڵێ. دواتر ئەوم گەڕاندەوە شوێنی خۆی، بۆ سەر دەستی راستم.

ئەو جارەی داوەكەم درێژتر كرد، نزیكەی دە سانتیم، ئێستاكە ویلیام دەیزانی دەبێ چی بكات. بە بێ ئەوەی بەو لاو بەملادا بكەوێ، هەنگاو بە هەنگاو خۆی گەیاندە كێكەكە. رێگەم پێدا جارێكی تر دەستی بگەیەنێتە كێكەكە.



هێندەی پێنەچوو ویلیام بە ئاسانی بیست و پێنج سانتیم لەسەر تەنافەکە ڕۆیشت (یان باشترە بڵێم لەسەر داوەکە ڕۆیشت). ویلیام لەسەر ئەو دەستە دەچوو بۆ سەر دەستەکەی دیکە تا بگاتە کێکەکە. دیمەنێکی نایاب و لەرادەبەدەر بوو. دیار بوو ئەو کارەی خۆی زۆر پێخۆش بوو.

دەستم لە نزیك فەرشەکە ڕاگرتبوو تا ئەگەر هاوسەنگیەکەی تێکچوو و لەسەر داوەکە کەوتە خوارەوە، ئازاری پێنەگات. بەڵام هەتتا بۆ یەك جاریش نەکەوتە خوارەوە.

دیار بوو ویلیام لە ئەساسدا ئاکرۆباتە. مشکێکی ئاکرۆبات.

ئێستا نۆبەی مێری بوو، ویلیامم لە پەنا خۆم دانا و پارچە کێکێکی گەورە و کشمیشێکم بە خەڵات پێدا. دواتر، سەر لە نوێ ئەو ڕاهێنانەم بۆ مێری دووبارە کردەوە. ئارەزووی دوور و درێژی من، گەورەترین ئارەزووی من ئەوە بوو ڕۆژێك ببمە خاوەنی سیرکێکی مشکی سپی. پێم خۆش بوو سەکۆیەکی بچووکم هەبا بە پەردەی سوورەوە، و کاتێك پەردەکان لادەدرێن، دانیشتوانی سیرکەکە نەمایشی جیهانی مشکە ئاکرۆباتەکان ببینن کە لەسەر تەناف دەڕۆن، لەسەر تەناف جۆلانەی دەکەن، و لە هەوادا خۆ هەڵدەگێڕنەوەو سەرمەقولاتان دەدەن. بە دارە

درێژەکانەوە دەردەپەڕن بەولاو بەملایاندا و کارەکانی تری کە ئارۆباتەکانی ناو سیرك ئەنجامیان دەدەن. دەمویست مشکەکان فێرکەم لەسەر شانی یەکتر دانیشن و چوار دەست و پێ بە دەوری سەکۆیەکەدا ڕابکەن. وام وێنا دەکرد لەگەڵ سیرك مشکە سپییەکان بە فرۆکە دەبەم بۆ سەرتاسەری گۆی زەوی و لەبەر دەم گەورە پیاوان و پاشاکانی ئەورووپا نەمایش دەدەیین.

لە ناوەراستی راهێنانی مێری دابووم، کە لەناکاو لە ژووری مۆسیقا دەنگە دەنگێکم بیست. دەنگەکە بەردەوام قایمتر دەبوو، گوێەکانم خەریك بوو دەتەقی بەو هەموو هەرا و هورییایە. دەنگی بەڕێوەبەری ترسناکی ئوتێل بەرێز **سترێنجێرم** ناسیەوە.

لە ناو دلّمدا وتم، یارمەتیم بدەن.

شوکری خوام کرد کە لە پشت ئەو پەردە گەورەیەم.

لەسەر ئەژنۆیان دانیشتم ولە تەنیشت پەردەکەوە سەیری دەرەوەم کرد. دەمتوانی بە ئاسانی هەموو شوێنەکانی ژووری مۆسیقا ببینم، بە بێ ئەوەی کەس بمبینێ.

گوێم لە دەنگی بەرێز **سترێنجێرم** بوو، خانمەکان دلّنیام ئێوە لێرە تەواو ئاسوودە دەبن.

دواتر بە چاکەتە کلکدارە رەشەکەیەوە لە دەرگا جمکەکەوە هاتە ژووری و لە کاتێکدا دەستەکانی بە هەردوو لادا کردبۆوە، دەستەیەکی گەورەی خانم فەرمووی ژوورەوە کردن. ئەگەر کارێتان بە ئێمە بوو، شەرم مەکەن. چایەکەش دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە لە هەیوانەکە ئامادەیە.

ئەوی وت و بە نیشانەی رێز لێنان کەمێك دوولا هاتەوەو لە کاتێکدا کاروانی گەورەی خانمانی ئەنجومەنی پاشایەتی پێشگیری لە ستەم کردن لە منداڵان، روویان لە ژوورەکە دەکرد، ئەویش دەرپەڕیە دەرێ. ئەوان جلی زۆر جوانیان لەبەر کردبوو هەمووشیان کڵاویان لەسەر بوو.

# کۆبوونەوە

دوای رۆیشتنی بەڕێوەبەری ئوتێل، ئیتر ئەوەندە نەدەترسام. چ شتێك لەوە باشتر، لە ژوورێکی پڕ لە خانمی بەرێزو بە شەخسییەت بەند بکرێی؟

ئەگەر بواری قسە کردنم هەبایە، لە وانە بوو، پێشنیاریان پێبکەم بێن بۆ قوتابخانەکەمان و پێشگیری لەو زوڵم و ستەمەی بکەن کە لە منداڵان دەکرێ. بە دڵنیاییەوە لەوێ دەمتوانی سوودیان لێ وەربگرم.

دوای ئەوەی هەموویان هاتنە ژوورەوە، بەرە بەرە هەرا و هوریایەکەیان کەم بۆوە. ئەوان بە دەوری ژوورەکەدا دەسوڕانەوە و جێگەی خۆیان دەست نیشان دەکرد و خولقی یەکتریان دەکرد. " میلی گیان، وەرە ئێرە لای من دانیشە"، سا‌ـ لام بئاتریس! لە کۆبوونەوە کۆتایی بەم لاوە ئیتر تۆم نەبینیویەوە! ئەو جلانەت چەند جوانە!

دەمویست لە هەمان شوێن دانیشم و راهێنان بە مشکەگانم بکەم و رێگەیان پێ بدەم ئەوانیش کۆبوونەوەی خۆیان ببەستن، بەڵام لە کەلێنی پەردەکەوە سەیرم دەکردن و چاوەڕوان بووم هەموو لەسەر جێگای خۆیان دابنیشن. وابزانم دوسەت

کەس دەبوون. لە پێش هەموو شتێکدا ریزی ئاخیری پڕ بۆوە. وا دیار بوو پێیان خۆش بوو تا ئەو جێیەی دەکرێ لە سەکۆیەکە دوور بن. لە ناوەراستی ریزی ئاخیر خانمێك دانیشتبوو و کلاوێکی سەوزی بچووکی لەسەر بوو، و بەردەوام پشتە ملی خۆی دەخوراند. ئارام و قەراری نەبوو. سەرنجم بۆ حالەتی پەنجەکانی راکێشرا، لەو کاتەی پشتە ملی خۆی دەخوراند. بەو مانایەی ئەو تێگەیشتبوو، یەکێك لە پشتەوە سەیری دەکات! ئەگەر بیزانیبایە، بە دڵنیاییەوە زۆری پێناخۆش دەبوو. بە خۆمم وت، نەکا سەری کرێژی هەبێت. لە ناکاو چاوم بە خانمی تەنیشتی کەوت، ئەوەیش هەمان کاری دەکات!

بە هەمان شێوە خانمەکەی تر!

و ئەویتر!

هەموو ئەو کارەیان دەکرد. هەموویان وەك شێتان پشتە ملی خۆیان دەخوراند.

ئایا قژەکانیان ئەسپێی پێوە بوو؟

زیاتر لە رشك دەچوو.



یەکێك لە کوڕەکانی قوتابخانە بە ناوی **ئاشتۆن** کۆرسی پێشوو سەری رشکی هەڵێنابوو و بەرپرسی تەندروستی قوتابخانە ناچاری کرد سەری بخاتە ناو تربانتین (مادەیەکە بۆ خاوێن کردنەوەی قژی سەر). ئەو کارە بوو بە هۆی لە ناو چوونی رشکەکان، بەڵام **ئاشتۆنیش** وەخت بوو لە ناو بچێت، چونکە نیوەی پێستی سەری هەڵتۆپابوو.

منیش بە سەرسامیەوە چاوم لەو خانمانەوە بڕیبوو. هەمیشە مرۆڤ لە سەیر کردنی کەسانێك کە کاری ناشیرین و بێ ئەدەبانە دەکەن و پێیان وایە کەس نایانبینێ، پێکەنینی دێ. سەر خوراندنیش کارێکی جوان و سەرنج ڕاکێش نییە، بە تایبەتی ئەگەر بە بێ وچان بەردەوامی هەبێ.

گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە بە دڵنیاییەوە سەریان رشکی هەیە.

لە هەمان کاتدا شتێکی زۆر سەیر روویدا. لە ناکاو یەکێك لە خانەکان پەنجەکانی لە ژێر قژەکانی فشاردا، مانای ئەو شتەی سەری دادەپۆشی، وەك قالب لەسەرەوە راوەستاو دەستی کردە بن قژەکانی و بەردەوام بوو لە خوراندندا!

لە ترسان هەموو گیانم وەسەر ئاو گەڕاو وەك بی دەلەرزیم. بە ترسەوە سەیری پشتەوەم کرد، بەڵکو دەرگایەکی بدۆزمەوە لە وێوە دەست بکەم بەڕا کردن. بەڵام هیچ دەرگایەکی لێ نەبوو. بە خۆمم وت، لە وانەیە بکرێ لە پشت سەکۆیەکەوە بازێك بدەم و خۆم بگەیەنمە ئەو دەرگا دوو لایە؟ بەڵام هەر دوو دەرگاکان داخرابوون و ژنێك لە پێشیانەوە دوولا هاتبۆوە و خەریك بوو شتێکی وەك زنجیری لە دەسکی دەرگاکە دەئاڵاند.

بە خۆمم وت، مەترسە، هێشتا کەس تۆی نەبینیوە، هیچ هۆیك نییە ئەوانە بگەڕێنەوە و سەیری پشت پەردەکە بکەن. بەڵام جووڵەیەکی نا وەخت، کۆخەیەك، پشمەیەك، چڵم هەڵلوشینێك، یان خشە خشێك بەسە، تا بکەویە چەنگی یەکێك لەو جادووگەرانە. نا، چەنگی دووسەت دانە جادووگەر.

پێیموایە لە هەمان کاتدا لە هۆش خۆم چووم. خۆڕاگرتن لە بەرامبەر ئەو هەموو شتە لە توانای کوڕێکی بچکۆلانە بەدەرە. بەڵام ئەو پێشهاتە یەك دوو چرکە سات زیاتر درێژەی نەکێشا، کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم، لەسەر فەرشەکە کەوتبووم و سپاس بۆ خوا، هێشتا هەر لە پشت پەردەکە بووم. لەو بەشەدا هیچ دەنگێك نەدەهات.

بە لەرزە لەرز، چۆکم دادا و دووبارە لە کەلێنی پەردەکەوە سەیرم کردن.

# بوون بە خەڵوز

هەموو ژنەکان، باشترە بڵێم جادووگەران لەسەر کورسیەکانیان دانیشتبوون و وەکو کەسانی هێپنۆتیزم کراو، چاویان لەو کەسەوە بڕیبوو کە لە پڕ لەسەر سەکۆیەکە بەدەر کەوت.

یەکەم شت کە سەرنجی منی راکێشا، قەد و باڵای ئەو ژنە بوو. ئەو ژنێکی ئاکار ورد بوو و رەنگە قەد و باڵای لە سەت و چل سانتیمەتر تێپەڕ نەکات. ژنێکی گەنجیش بوو، پێموا نییە تەمەنی لە بیست و پێنج شەش ساڵێك زیاتر بێ و زۆریش جوان بوو. کراسێکی رەش و درێژ، تارادەیەك جوانی لەبەر بوو کە دەگەیشتە سەر ئەرز و ئەو دەستکێشە رەشانەی لە دەستی بوون تا ئەنیشکی هەڵکشابوو، و بە پێچەوانەی ئەوانی تر، کڵاوی لەسەر نەبوو.

شیوەی هەر لە جادووگەر نەدەچوو، بەڵام مەحاڵ بوو لەگەڵ جادووگەران نەبێ، ئەگینا هۆی ئامادە بوونی لەسەر ئەو سەکۆیە چی بوو؟

نەمدەزانی بۆچی جادووگەرانی تر بە حاڵەتی دەستخۆشی و ترس و لەرزەوە بەو شێوەیە چاویان تێوە بڕیووە.

خانمی گەنج لەسەر سەکۆیەکە، زۆر بە ئارامی دەستی برد بۆ لای دەموچاوی. پەنجەی دەستکێش لەبەری شتێکی لە پشت گوێی هەڵگرت و دوایی... رومەتەکانی توند گرت و دەموچاوی لە جێی خۆی هەڵگرت! تەواوی ئەو دەموچاوە جوانە لەناو دەستیدا بوو.

ئەو دەموچاوە، نیقاب بوو!

دوای هەڵگرتنی نیقابەکە، گەڕایەوە و زۆر بە وردی لەسەر مێزێکی بچووکی نزیك خۆی دانا و دواتر گەڕایەوە رووی کردە ئێمە. چی وای نەمابوو بە دەنگێکی بەرز هاوار بکەم.

دەموچاوی سەیرترین و ترسناکترین شتێك بوو کە تا ئەو کات بینیبووم. هەرکە چاوم پێکەوت، هەموو گیانم وەك بی دەستی کرد بە لەرزین. دەموچاوی بە رادەیەك چرچ و لۆچ و شل و پل و زریو بوو، دەتگوت لە ناو سرکەیان هاویشتووە. دیمەنێکی ترسناك و قێزەونی هەبوو. حاڵەتێکی زۆر ترسناکی لە دەموچاوی دابوو، حاڵەتێکی بۆگەن و پیس و چەپەڵ. دەوری دەموچاوی بەراستی بۆگەنی کردبوو پێستی ناوەراستی دەموچاو و دەوروبەری لێو و رومەتەکانی وەها برین و زیبکە و چڵکی کردبوو پێدەچوو کرمی هەڵێنابێ.

زۆر جار وا دێتە پێش، شتێك لەبەر زۆری ئەو ترسەی تێدایە مرۆڤ سەرسام دەکات و چاوی لەسەر هەڵناگرێ.

منیش ئەو حاڵەتەم هەبوو، ئاگام لە خۆم نەمابوو. تەزیو و بێ هەست ببووم. من شەیدای ئەو ترس و لەرزە بووم کە بە دیتنی باڵای ئەو ژنە لە مندا دروست ببوو. بەڵام هەستێکی تریش جگە لە ترس و لەرز بە بینینی ئەو ژنە لە مرۆڤدا

دروست دەبوو. لە چاوەکانیدا جۆرە خراپەکارییەك بەدی دەکرا، مرۆڤەکان بەو



نیگایانە هەستیان بە ترس دەکرد.

دەست بەجێ تێگەیشتم کە ئەو ژنە هەمان جادووگەری مەزنە. هۆی دانانی نیقابەکەشم زانی. ئەو نەیدەتوانی بە سیمای واقیعی خۆیەوە بەدەر کەوێ و لە ناو هوتێلەکەدا نیشتەجێ بێ.

چونکە هەموو بە بینینی ئەو، بە هات و هاوارەوە دەستیان دەکرد بە ڕاکردن.

جادووگەری مەزن بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، دەرگاکان! دەرگاکان توند و زنجیر کراون؟

یەکێك لە ئامادە بووان وتی، دەرگاکان توند وتۆڵ و زنجیر کراون، گەورەم.

چاوەکانی وەك چاوی ماری کوێراو بریقەدار بوو، دەموچاوە کرماویەکەی ڕێك لەو جادووگەرانەوە ڕامابوو، کە لە بەرامبەری دانیشتبوون. ئەو هاواری کرد، دەفتانن دەستکێشەکانتان دەرفێنن! تیگەیشتم دەنگی وەکو دەنگی ئەو جادووگەرەیە کە لە ژێر درەختی زیزفۆنم بینیبوو. لەرینەوەیەکی زەنگداری هەبوو، بەڵام دەنگی ئەو زۆر قایمتر و تیژتر بوو، وەك دەنگی لە چیرەوە بردنی ددان، وەك روشاندن و تاشین، وەك دەنگی قیژە، و وەك دەنگی نەڕاندن.

هەموو خەریکی دەرهێنانی دەستکێشەکانیان بوون. من لە پشت پەردەکەوە سەیری دەستی ئەو ژنانەم دەکرد کە لە ریزی ئاخیر دانیشتبوون. زۆرم پێخۆش بوو بزانم قامکەکانیان بەو شێوەیەن کە نەنکم دەیوت یا نا، ئاخ! بەڵێ! ئێستا دەمتوانی چەند پەنجەیەك ببینم. نوکی پەنجەکانیان خوارو خێچ و قاوەیی بوو!





دریژی پەنجەکانیان نزیکەی پێنج سانتیمەتر بوو و نوکەکەیان تیژ بوو!

جادووگەری مەزن دەوەڕی، دەفتانن پیلاوەکانتان دەرفینن!

جادووگەران پیلاوە باریك و پاژنە بەرزەکانیان داکەندن. و هەموو بە کۆمەڵ هەناسەیەکی رەزامەندانەیان هەڵکیشا. لە ژێر کورسیەکەوە سەیریکی قاچ و قولی گۆرەوی پۆشی ئەوانم کرد، قاچەکانیان چوار گۆش بوون، هەتا یەك پەنجەشیان نەبوو. دیمەنیکی قیزەون بوو، دەتگوت پەنجەکانیان بە چەقوی قەسابی پەڕاندوون.

جادووگەری مەزن بە زمانیکی توند و ناخۆشەوە وتی، دەفتانن پرچە دستکردەکەتان دەرفینن!؟

ئەو بە شێوەیەکی تایبەت قسەی دەکرد. بە رواڵەت ئاخاوتنی جیاواز بوو. بە توندی و لە بن گەرویەوە قسەی دەکرد و دیار بوو پیتی" و" بە باشی بۆ نەدەهات. پیتی" و" شی زۆر بە سەیری بۆ دەهات.



وەك ئەوەی پێش قسە کردن، وەك پەتاتەی گەرم لە ناو زاریدا هەڵیدەسوڕاند و دواتر هەڵیدەدایە دەرەوە. پرچە دەستکردەکانتان دەرررررر بێنن با پێستی لکەداری سەرتان هەوایەکی لێ بدات! هەموو دەستەکان بۆ لای سەرەکان رۆیشت تا پرچە دەستکردەکان و کڵاوەکانی سەریان لابەن و دواتر هەناسەیەکی ئاسوودەی بە کۆمەڵ لە ناو ژوورەکەدا دەنگی دایەوە. ئێستا هەر سەری تاس بوون لە پێش من دەبینران، دەریایەك پێستی روت و بێ پۆشیش، کە لەبەر کڵاوەکان سوورتر ببوونەوە و بلۆقیان کردبوو. ناتوانم شرۆڤەی بکەم کە چەند دیمەنێکی ترسناك و بڕوا پێنەکراو بوو، زیاتر لەم رووەوە بڕوا پێنەکراو قێزەون بوو، لە گەردنیانەوە بۆ خوارێ ئەو سەرە دەڵەمە و کەچەڵ و ترسناکانە، لەش و لارێك بوون کە داپۆشرابوون بە جل و بەرگێکی جوان و مۆدی رۆژ. ترسناك بوو، نائاسایی بوو.

به خۆمم وت، خوایه یارمەتیم بده! خوایه ڕەحمم پێبکەی! لەو بوونەودرە مێیه پیس و کەچەل و چەپەڵانه که هەموویان منداڵ کوژن، من له ناو ژوورێکی پڕ له منداڵ کوژ بەند کراوم و ڕێگەی دەرباز بوونم نییه! له هەمان کاتدا، بابەتێکم وەبیر هاتەوه که ترسەکەی منی چەند بەرابەر کرد.

نەنکم وتبووی ئەوانه به لوته تایبەتیەکەیانەوه دەتوانن تەنانەت له شەوی تاریکیشدا منداڵان له مەودایەکی زۆر دووردا شوناسایی بکەن. تا ئێستا هەر چی نەنکم وتویەتی ڕاست بووه. ئەگەرێکی زۆری هەبوو هەر دەم یەکێك له جادووگەرانی ریزی پشتەوه بۆنی من بکات و هاواری پیسایی و کشپل! له ناو ژوورەکەدا دەنگ بداتەوه و منیش وەك مشکێك بکەومه ناو تەڵەوه.

لەسەر چۆکان له پشت پەردەکه، لەسەر عەردی دانیشتبووم و هەناسەم بۆ نەدەهات.

یەکسەر شتێکی زۆر گرنگی تر که نەنکم پێی وتبووم، هاتەوه یادم، هەرچەند چلکن و پیس بی، جادووگەران به زەحەمتتر دەتوانن هەست به بۆنت بکەن.

دوایین جار کەی خۆم شوشتبوو؟

زۆر لەمێژ نەبوو، من ژوورێکی به جیا و تایبەتم هەبوو و نەنکیشم بۆ ئەو جۆره شتانه زەختی لێ نەدەکرم. به باشی که بیرم کردەوه، وەبیرم هاتەوه دوای هاتنمان، ئیتر خۆم نەشوشتبۆوه. دوایین جار کەی دەست و دەموچاوم شوشت؟

ئەورۆ بەیانی خۆ نەمشوشتووه.

دوێنێشم نەشوشتبوو.

سەیرێکی دەستکانم کرد. پڕ بوو لەپەڵه و تەپ و تۆز و خودا دەزانێ چی تریشی پێوه بوو. لەوانەیه لەبەر ئەو شتانه شانسم هەبێ. به دڵنیاییەوه بۆنی هێلنج هێنەر له ناو ئەو هەموو پیسی و چەپەڵیدا ناتوانێ له هەوادا بڵاو بێتەوه.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، جادووگەرانی بەلیتانیا! تێگەیشتم بۆ خۆی نە پرچە دەستکردەکەی لابردەوە، و نە دەستکێشەکانی دەرهێناوە و نە پێلاوەکانیشی. دیسان نەڕاندیەوە، جادووگەرانی بەلیتانیا!

ئامادەبووان بە نیگەرانیەوە لەسەر کورسیەکانیان جوڵە جوڵێکیان کردو قیت دانیشتن.

ئەو نەڕاندی، ئەی جادووگەرە داماوەکان! ئەی جادووگەرە بێ کەلك و گێلەکان! ئەی جادووگەرە دەست و پێ سپی و بێ مێشکەکان! ئێوە پۆلە کرمێکی بێ عار و کات بە فیرۆ دەرن!

ئامادەبووان ترسان و کەوتنە لەرزین. وا دیارە، هەموو تێگەیشتوون کە جادووگەری مەزن زۆر توڕەیە. وا دیارە شتێکی ترسناك قەرارە رووبدات.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، ئەورۆ بەیانی خەرررریکی، خوارررردنی نان بووم و لە پەنجەرەوە سەیری کەنار ناوەکەم دەکرد، دەزانن چاوم بە شی کەوت؟ لە ئێوە دەپرررسم، شیم بینیوە؟ سەدان، هەزاران منداڵی بچووك و بۆگەن و قێزەون کە لە ناو چەو و لمدا خەرررریکی گەمە کردنن! ئیشتیام کوێررر بۆوە! بۆشی لە ناوتان نەبردوون؟ دواتر نەڕاندی بۆشی هێشتاش هەررر لە ناوتان نەبردوون؟

بە وتنی هەر وشەیەك، دڵۆپە بەڵغمی شینی کاڵ وەك تۆپەڵەیەکی بچووك لە زاری دەردەپەڕی.

دیسان قیژاندی، لێتان دەپرسم بۆ شی؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.

ئەو قیژاندی، منداڵەکان بۆنیان لێ دێ! دنیای بۆگەن دەکەن! ئێمە ئەو منداڵانەمان ناوێن! هەموو ئامادەبووان بە نیشانە پشتگیری کردن لە قسەکانی سەرە کەچەڵەکەیان لەقاند.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، هەفتەی منداڵێك هەرگیز رازیم ناکات! ئێوە هەر ئەوندە و لەدەست دێ؟

ئامادە بووان لەبەر خۆیانەوە وتیان، کارەکەمان باشتر دەکەین. کارەکەمان زۆر باشتر دەکەیین.

جادووگەری مەزن نەڕاندی، باشترریش هەر رازیم ناکات! من لانی زۆرری ئەنجامەکەم دەوێ! فەرمانتان پێدەکەم تا ساڵی داهاتوو کە دێمەوە ئێرە، دەبێ تەواوی منداڵانی ئەو وڵاتە لە ناو چووبن! لە مەبەستم گەیشتن؟

ئامادەبووان هەناسەبڕکێ ببوون. جادووگەران بە بەدبەختی و بێ دەرەتانیەوە سەیری یەکتریان دەکرد. یەکێك لە جادووگەرانی ریزی پێشەوە بە دەنگێکی بەرز وتی، هەموویان! خۆ ئێمە ناتوانین هەمووانیان بە تەواوی لە ناو بەرین!



جادووگەری مەزن بە بیستنی ئەو دەنگە، بە خێرایی بەدەوری خۆیدا سوڕایەوە، وەك ئەوەی شیشیان تێڕاکردبێ، زۆر بە توندی و توڕەییەوە وتی، کێ بوو ئەو قسەی کرد؟ کێ وێرررای لەسەر قسەی من قسە بکات؟ دواتر پەنجەی داپۆشراو بە دەستکێشی وەك سوژن بۆ لای ئەو جادووگەرەی ئەو قسەیەی کردبوو ڕاداشت و وتی، ئەتۆ بووی؟ ها؟

جادووگەر هاواری کرد، مەبەستم ئەوە نەبوو، گەورەم! نەمدەویست لەسەر قسەی تۆوە قسە بکەم لەگەڵ خۆمم قسە دەکرد!

جادووگەری مەزن هاواری کرد، چۆن وێرررات قسە لەسەر قسەی من بکەی؟

جادووگەری بەدبەخت لە ترسان بە لەرزە کەوت، بە دەنگێکی بەرزەوە وتی، من تەنیا لەگەڵ خۆمم قسە دەکرد! سوێندت بۆ دەخۆم گەورەم!

جادووگەری مەزن بە خێرایی هاتە پێشەوە، هەر لەگەڵ بەرز بوونەوەی دەنگی، لە جێی خۆم ویشك بووم.

جادووگەرە نەزانێکی وەڵامم بداتەوە. دەبێ بسوتێنرێ تا ئیسقانەکانی دەبێتە خۆڵەمێش!

هاواری پاڕانەوەی جادووگەرەکە لە هەوادا بڵاو بۆوە نا،نا!

جادووگەری مەزن بەردەوام بوو: جادووگەری گێل و بێ مێشك دەبێ لە ناو بڵێسەی ئاگردا قرچە قرچی بێت!

جادووگەری داماو هاواری کرد، رزگارم بکەن! جادووگەری مەزن بە بێ ئەوەی کەمترین بایەخی پێبدات، بەردەوام بوو: جادووگەرێگی نەزانی وەك تۆ دەبێ لەسەررر ئاگر ببێتە کەباب!

تاوانباری داماو هاواری کرد، گەوردم، لێم ببوورە! مەبەستم ئەوە نەبوو! بەڵام جادووگەری مەزن بە تاك ژەنیەکی ترسناکەوە بەردەوام بوو.

جادووگەرێکی زاتی رررەتکردنەوەی قسەی منی هەبێ. ماوەیەکی زۆر لە ناو ئیمەدا نامێنێتەوە.

دوای ئەو قسانە لافاوێك پریشکی بریسەداری سپی کە هاڵاویان لێ هەڵدەستا، لە چاوەکانی جادووگەر هاتە دەرو و یەکراست چوو بۆ لای ئەو جادووگەرەی وێرابووی ئەو قسانە بکات. پریشکەکانی پێکەوت و چوو لە ناو جەستەیەوە. جادووگەر بە شێوەیەکی ترسناك نەڕاندی و کۆمەڵێك دوکەڵ لە دەوروبەری بڵند بوو. بۆنی گۆشتی سوتاو ژوورەکەی پڕ کرد.

هیچ کەس لە شێوێنی خۆی نەجولاّ. هەموویان وەك من لە دوکەڵەکەوە ڕامابوون، دوای چەند چرکە ساتێك دوکەڵەکە تەواو بوو. سەیری کورسیەکەم کرد، بەتاڵ بوو. چاوم بە تۆپەڵێك شتی سپی کەوت کە وەك هەورێکی بچووك لە هەوادا چوو سەرێ و لە پەنجەرەکەوە رۆیشتە دەر.

ئاهی قووڵی ئامادەبووان لە ژوورەکەدا دەنگی دایەوە.

جادووگەری مەزن بە مۆڕەوە سەیری ئەولاو ئەملای ژوورەکەی کرد و وتی، هیوادارررم ئیتر ئەمڕۆ هیچ کەس لەبیرری بەرپەرچدانەوەی مندا نەبێ.

بێدەنگیەکی مەرگ هێن و ترسناك باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو.

جادووگەری مەزن وتی، وەکو یەك پیراشکی (جۆرە کێکێکە) بوو بە چزیلك. وەکو گێژەر ئاوەکوڵ بوو. هەررگیز نایبیننەوە. ئێستا دەتوانین بە کارەکەمان ڕابگەیین.



# چـــالاكی هـــەنگاو بـــە هـــەنگاوی یاســـای دروستكردنی مشك ژمارە ٨٦

جادووگەری مەزن هاواری كرد، منداڵەكان قێزەونن! ئێمە ئەوان لە ناو دەبەین! ئێمە ڕەچەڵەكیان لەسەر گۆی زەوی ناهێڵین! ئێمە ررر‌ەگ و رریشەیان ویشك دەكەین.

ئامادەبووان هاواریان كرد، بەڵێ، بەڵێ! لە ناویان دەبەین! رەچەڵەكیان لەسەر گۆی زەوی ناهێڵین! لە ریشەوە ویشكیان دەكەیین!

جادووگەری مەزن وەكو بەبر نەڕاندی. منداڵەكان بۆگەنیو و هیچ و پوچن!

جادووگەرانی بەریتانیا وە دەنگ هاتن، راستە! راستە!

جادووگەری مەزن نەڕاندی، منداڵەكان پیس و بۆگەنن!

جادووگەران بە گەرمیەكی زیاترەوە هاواریان كرد، پیس و بۆگەنن!

جادووگەری مەزن بە دەنگێكی ناخۆشەوە وتی، منداڵەكان بۆنی پیسایی و كشپلیان لێ دێ!

ئامادەبووان هاواریان کرد، پف! پف! پف! پف!

جادووگەری مەزن هاواری کردەوە، ئەوانە لە پیسایی و کشپلیش خراپترن!

پیسایی و کشپل لە بەرامبەر بۆنی ئەواندا، بۆنی وەنەوشە و پنگی لێ دێ!

ئامادەبووان بە یەکدەنگی یەوە وتیان، وەنەوشە و پنگ!

ئەوان لەگەڵ هەر وشەیەك کە لەسەر سەکۆیەکەوە دهات، چەپلەیان لێدەدا و هوڕیاویان دەکێشا. وابزانم وتار بێژەکە بە تەواوی ئەوانی خستبوو ژێر کاریگەری خۆیەوە.

جادووگەری مەزن نەڕاندی، قسە کردن سەبارەت بە منداڵان بێزارم دەکات، هەرکە بیریشیان لێ دەکەمەوە، هێڵنجم دێ! برررۆن ولەگەنێکی رشانەوەم بۆ بێنن.

جادووگەری مەزن وچانێکی گرت و لە سیمای بە زەوقی ئامادەبووان ڕاما. ئەوان بە تامەزرۆوە چاوەڕوان بوون.

جادووگەری مەزن هوڕیاوێکی کێشا، ئێستا پێتان دەڵێم چ پلانێکم هەیە! من پلانێکی گەورەم بۆ رررزگار بوون لە چەنگی یەك یەکی منداڵانی بەریتانیا ئامادە کردووە.

جادووگەران خێرا خێرا هەناسەیان ددا. زاریان داچەقابوو. ئاوڕیان دایەوە و بە خۆشحاڵیەوە زەردەخەنەی قێزەونیان بۆ یەکتر دەکرد.

جادووگەری مەزن نەڕاندی، بەڵێ، ئێمە ئەوان تێك و پێك دەشکێنین، ورد و هاڕیان دەکەیین، هەموو منداڵە بۆگەنیوەکانی بەریتانیا بە یەگجاری لە ناو دەبەیین.

جادووگەران چەپڵەیان لێداو هاواریان کرد، بژیت، ئێوە یەك پارچە زێر و جەواهێرن، گەورەمان، ئێوە هاوتاتان نییە!

جادووگەری مەزن بە سەریدا قیژاندن، دەمتان داخەن و گوێ بگرن! بە باشی گوێ بگرن و رێگە مەدەن لەوە زیاترر رۆڵ بگێڕین!

ئامادەبووان بە زەوقەوە خۆیان بۆ پێشەوە خوار کردەوە تا بزانن ئەو کارە سیحراویە چۆن جێبەجێ دەبێ.

جادووگەری مەزن نەڕاندی، هەمووتان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ شارەکانتان و دەست لە کار بکێشنەوە. خانەنشین! جوان گوێ بگرن! خانەنشین!

جادووگەران هاواریان کرد، بەڵێ بە چاوان، ئێمە دەست لە کار دەکێشینەوە!

جادووگەری مەزن بەردەوام بوو، دوای ئەوەی دەستتان لە کار کێشایەوە، هەمووتان دەرررۆن...

وچانێکی گرت.

جادووگەران هاواریان کرد، دەبێ چی بکەین؟ پێمان بڵێ دەبێ چی بکەین ماموستای گەورە و مەزن، ئێمە دەبێ چ کارێکی بکەین؟

جادووگەری مەزن هاواری کرد، دەرررۆن و دوکانی شیرینی فرۆشتن دەکەنەوە!

جادووگەران هاواریان کرد، شیرینی بفرۆشین! قەرارە شیرینی بفرۆشین! چ تەخشان و پەخشانێك!

هەمووتان هەریەکە و شیرینی فرۆشیەکی بکەنەوە. دەبێ باشترین و نەجیبترین شیرینی فرۆشیەکانی بەریتانیای بکڕن!

جادووگەران وەڵامیان دایەوە، بەسەر چاو، بەسەر چاو، دەنگە ناخۆشەکانیان لە ناو ژوورەکەدا بە شێوەیەك دەنگی دەدایەوە وەك ئەوەی سەت پزیشکی ددان ئامێری کۆڵینیان بەیەکەوە هەڵکردبێ.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، مەبەستم ئەو دوکانە گاڵتەجاڕیانەی کە رۆژنامە و جگەرە و چکولیاتیان تێدا دەفرۆشن نییە، ها! من باشترین دوکانەکانی شیرینی فرۆشیم دەوێ کە لە ناو جامخانەکەیدا بە قەدەر کێوێك شیرینی و چکولیاتی بەتام و خۆش بە جوانی دانراون!

جادووگەران هاواریان کرد، باشترین! ئێمە باشترین شیرینی فرۆشیەکانی شار دەکڕین!

جادووگەری مەزن لە خۆشیان هاواری کرد، هەر شتێکی پێویستان بوو هیچ زەحمەتی بۆ ناکێشن، چونکە چوار بەرابەرررری نرخی راستەقینەی پێشنیار دەکەن و هیچ کەسیش ئەو پێشنیارەی ررڕەت ناکاتەوە! ئێوە باش دەزانن پارە بۆ ئێمەی جادووگەر مەسەلەیەکی گرنگ نییە. من چوارررر گەلآبەی پڕررم پارە(اسکناس) لە بەریتانیاوە لەگەڵ خۆم هیناوە، پارە(اسکناس) نوێیەکان. دوایی بە حاڵەتێکی بێزارکەرەوە وتی، هەموویان لە ناو ولآتدا دروست کراون.

جادووگەران بە بیستنی ئەو قسەیە بە خۆشی و زەوقەوە دەستیان کرد بە پێکەنین.

یەکێك لە جادووگەران بە جۆرێك لە بەدەست هێنانی ئەو ئیمکاناتەی کە بوون بە خاوەنی شیرینی فرۆشی، بەدەستی دێنا، خۆشحاڵ ببوو کە لەسەر جێگەکەی هەستا و هاواری کرد، منداڵەکان پۆل پۆل دێن بۆ دوکانەکەم و منیش شیرینی و چکولیاتی ژەهراویان دەدەمێ و هەموانیان وەك مشك لە ناو دەبەم.

لەپڕ هەموویان بێدەنگ بوون. جەستەی جادووگەری مەزن بە هۆی تورەیی زۆرەوە وەکو داری ویشك قیت بۆوە و قیژاندی، کێ بوو قسەی کرد؟ ئەتۆ بووی؟ لەگەڵ تۆمە؟



تاوانبار بە خێرایی دانیشت و دەموچاوی خۆی بە پەنجەکانی داپۆشی.

جادووگەری مەزن هاوارێکی کرد، ئەی ساویلکە و زۆر بلّێ! ئەی دێوەزمەی بێ مێشك! ئەقلت پێ ناشکێ، ئەگەر شیرینی ژەهرڕراوی بدەیە منداڵان لە ماوەی پێنج خولەك کۆتایی بە ژیانت دێ. لە هەموو ژیانمدا پێشنیارێکی ئەوها گێلانەم لە جادووگەرێك نەبیستبوو!

هەموو ئامادەبووان خۆیان کۆکردەوە و دەستیان کرد بە لەرزین. بەدڵنیاییەوە ئەوانیش وەکو من بیریان دەکردەوە کە جارێکی تر ئەو پریشکە نورانی و سپیانە لە هەوادا دەدرەوشێنەوە.

بەلاّم بە سەرسامیەکی تەواو ئەو شتە رووی نەدا.

جادووگەری مەزن دەینەڕاند، لەبەر ئەوەیە کە تا ئێستاش ئەو هەموو منداڵە لە بەریتانیادا دەسوڕێنەوە، لەوانەیە مێشکی هەمووانتان پڕ بێ لەو بیرۆکە بێ مانایانە.

دووبارە بێدەنگی باڵی کێشایەوە. جادووگەری مەزن لە ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە ڕاما و بە دەنگێکی بەرزەوە وتی، هێشتاش هەر نازانن ئێمەی جادووگەر تەنیا کەلك لە سیحر و جادوو وەردەگرین؟

جادووگەران بە یەکەوە وەلاّمیان دایەوە، بۆچی دەزانین گەورەم! ئاشکرایە کە دەزانین!

جادووگەری مەزن دەستە رەق و تەق و دەستکێش پۆشەکانی لێك خشاند و هاوارێکی کرد، لەبەر ئەوە هەمووتان خاوەنی یەك شیرینی فرۆشی بەشکۆن! هەنگاوی دواتر ئەویە لە ناو جامخانەی دوکانەکانتان ئاگادارییەك هەلّواسن و بنووسن لە رۆژێکی دیاریکراودا جەژنێکی گەورە و بەشکۆ دەگرین و بە هەموو منداڵەکان شیرینی و چکولیاتی بەلاش دەدەین.

ئامادەبووان هاواریان کرد، ئەو ئاگاداریە، ئەو توتیلە بە تەماح و نەوسنانە رادەکێشێتە ناو دوکانەکە، ئەوان بۆ شیرینی و چکولیات ملی خۆیان دەشکێنن!

جادووگەری مەزن بەردەوام بوو، دوایی هەمووتان شیررینی و چکولیاتەکان بە گەورەترین و دوایین فرمول ویاسای جادوویی من پڕررر دەکەن! ئەو فرمولە ناوی ئەویە، چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی یاسای دروستکردنی مشك ژمارە ٨٦!



جادووگەران وەدەنگ هاتن، چالاكی هەنگاو بە هەنگاوی دروستكردنی مشك!
ئەو دیسان دەستی پێكردۆتەوە! گەورەكەمان جادوویەكی سەرسوڕهێنەری دیكەی بۆ لە ناو بردنی منداڵان دروست كردووە! ئەی مێشكی بیرمەند، ئێمە چۆن دەتوانین ئەو كارە بكەین؟

جادووگەری مەزن وەڵامی دایەوە، ئارررام بگرن، یەكەم جار، چۆنیەتی كارررری چالاكی هەنگاو بە هەنگاو یاسای دروستكردنی مشك ژمارە ٨٦ تان بۆ شیبكەمەوە. باش گوێ بگرن.

ئامادەبووان لە كاتێكدا لەبەر زۆری خۆشحاڵی لەسەر كورسیەكانیان هەڵبەز و دابەزیان دەكرد، هاواریان دەكرد، گوێمان لێتە!

جادووگەری مەزن وتی، فرررمول یان یاسای دروستكرنی مشك، شلەیەكی سەوزە. یەك قەترە لەو شلەیە بەسە بۆ شیرینیەك یان چكولیاتێك.

مەسەلەكە بەم شێوەیە دەبێ:

منداڵەكە ئەو چكولیاتەی كە شلەی دروستكەری مشكی تێدایە، دەیخوات...

منداڵەكە بە حاڵێكی زۆررر باش دەچێتەوە ماڵێ...

منداڵەكە بە حاڵێكی زۆررر باشەوە چوو بۆ ناو جێگاكەی...

منداڵەكە بەیانی بە حاڵێكی باشەوە لەخەو هەڵدەستێ...

منداڵەكە بە حاڵێكی باشەوە دەچێتە قوتابخانە...

ئاگادار بن ئەو فررمولە وردە وردە كاریگەریەكەی بەدەر دەكەوێ و تا ئێستا كاریگەر نەبووە...

ئامادەبووان هاواریان كرد، تێگەیشتین ئەی بیرمەند، ئەدی كەی كاریگەریەكەی دەست پێدەكات؟

جادووگەری مەزن بە ئاوایەکی سەرکەوتووانەوە هاواری کرد، ررریك کاتژمێر نۆ کە منداڵەکە لاقی دەخاتە ناو قوتابخانە! منداڵەکە دەگاتە قوتابخانە. چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی دروستکردنی مشك کارەکەی دەست پێدەکات. منداڵەکە وردە وردە بچووك دەبێتەوە. منداڵەکە وردە وردە توکاوی دەبێ. منداڵەکە وردە وردە کلکی بۆ دروست دەبێ. ئەو شتە دروست بیست و شەش چرکەسات دەخایەنێ. دوای بیست و شەش چرکەسات منداڵەکە ئیتر منداڵ نییە، مشکە!

جادووگەرەکان هاواریان کرد، یەك مشك! چ بیرۆکەیەکی جادووگەرانە!

جادووگەری مەزن هاواری کرد، پۆلەکانی خوێندن پڕ دەبن لە مشك! لە ناو قوتابخانەکانی بەریتانیا جەنجاڵ دروست دەبێ؟ مامۆستاکان خۆیان بەولاو بەملادا دەدەن! مامۆستا ژنەکان دەچنە سەر مێزەکان و تەنورەکانیان بڵند دەکەن و دەنەڕێنن،" فریامان کەون، یارمەتیمان بدەن، یارمەتی!

ئامادەبووان هاواریان کرد، راستە، زۆر راستە!

جادووگەری مەزن بە دەنگی بەرز وتی، دەزانن دواتر لە ناو قوتابخانە چی روویدەدات؟

جادووگەران هاواریان کرد، چ روودەدات؟ ئەی بیرمەند؟!

جادووگەری مەزن گەردنی کە زیاتر لە قاز دەچوو هێنایە پێشێ و زاری قژ کرد، دوو ددانی نوك تیژ و بە ئاستەم شینی بەدەر کەوت. دەنگی بەرزتر کردەوە و قیژاندی، ئینجا تەڵە مشکەکان بەدەر دەکەون!

جادووگەران هاواریان کرد، تەڵە مشکەکان؟

جادووگەری مەزن هاواری کرد، هەروەها پەنیرر. مامۆستاکان لە قوتابخانە دێنە دەرێ و خێررا دەرۆن تەڵە مشکان دێنن، و پەنیریان لە ناو داوێن و لە ناو قوتابخانە دایان دەنێن! مشکەکان وردە وردە پەنیرەکان دەخۆن! فەنەری تەڵە

مشکەکان دەردەپەڕن. لە هەموو شوێنێکی قوتابخانە فەنەری تەڵەکان بە تەقە تەق دەردەپەڕن و سەری مشکەکان وەك کەللا لە تەڵە مشکەکان دێنە دەریْ! هەموو شوێنێکی بەریتانیا، لە هەموو قوتابخانەکانی بەریتانیا، فەنەری تەڵەکان دەتەقن و مشکەکان پێوە دەبن!

جادووگەری مەزنی پیر و ڤیژەون لە کاتێکدا لاقی لە ئەرزەکە دەکوتا و دەستی لێك دەخشاندن، لەسەر سەکۆیەکە خەرێکی سەمای جادووگەری بوو.

هەموو ئامادەبووانیش لەگەڵی دەستیان کرد بە هەڵپەڕین و چەپڵە لێدان.

ئەوان هاتو هاوارێکی ترسناکیان دانابوو، کە بە خۆمم وت، بەدڵنیاییەوە ئێستا بەرێز **سترێنجێر** لە دەرگا دەدات. بەڵام هیچ دیار نەبوو.

ئەو کات، لە ناو ئەو هەموو قاو ڤیژەدا، دەنگی ئاوازی ناخۆشی وەك نەڕەی جادووگەری مەزن بلّند بوو. ئەو بە خۆشی و شادیەوە ئاوازێکی گاڵتەجاڕرری دەوت.

مرررردن و نەمان بۆ منداڵان.

ئێسقانەکانیان بکوڵێنن و پێستەکەیان بکەنە کەباب!

ورد و هاڕیان کەن! بیانکوژن! بیانکوتن!

لەت و پەتیان کەن! هەڵیاندڕن!

هەڵیاندەن! بیانشکێنن!

چکولیات و پۆدری جادوویی، دەرخواردی ئەو وردیلانە دەن!

بلێن، زووکەن، بیانخۆن، توند توند بخۆن، زوو بیانخۆن!

سگیان پڕکەن

لە شتی نووسێن

بە زاری پڕەوە بیانێرنەوە ماڵیْ

کە رۆژ بۆوە ئەو بیْ مێشکانە

هەریەکە و دەڕۆن بۆ قوتابخانەیەك
کچەکە حاڵی زۆر خراپ دەبێ، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و زۆر بە توندی هاوار دەکات، ئەی هاوار سەیرکەن، کلکم هەیە!
کوڕەکەی تەنیشتی دەقیژێنێ، فریام کەون، توکن بووم!
یەکێکی تریان هاوار دەکات، بۆچی ئێمە ئەوهامان لێ دێت؟
هەموو دەموچاومان دەبێ بە سمێڵ
ئەو کوڕە گێل و لینگ درێژە
بە گریانەوە دەڵێ، ئاخر چی بووە؟ من بچووك بوومەوە؟
لە جەستەیان، لەناکاو دەردێ
چوار پێی بچووك
لەپڕ دەبینی، بوونە مشك!
لەناو قوتابخانەکان تا بڵێی
مشکەکان لە هەموو شوێنێ دێن و دەچن!
مامۆستاکان بێزار دەبن
دەنەڕێنن، ئەوانە لە کوێوە هاتن؟
دەچنە سەر مێزەکان و هاوار دەکەن
بڕۆن وون بن مشکە پیسەکان، بڕۆن لێرە!
تووخوا یەکێك بڕوات و تەڵە مشك بێنێ!
لە بیری نەکا پەنیری تێباوێ!



تەڵەمشکەکە دێ و لەپڕ دەڵێ

تاق و تاق، ترررروق و ترررروق.

ئەو تەڵە مشکانە، چ فەنەرێکی باشیان هەیە

فەنەرەکان لەناوکاو دەدەپەڕن

ئاخ چ دەنگێك، ئاخ چ دەنگێك!

بۆ جادووگەرێك وەك مۆسیقایە!

هەموو شوێنێك پڕ دەبێ لە مشکی مردوو

مرۆڤ تا ئەژنۆی بە ناو ئەو مشکە تۆپیوانەدا رۆدەچێ

بەڵام بۆچی ئەو منداڵانە دیار نین؟

مامۆستاکان خەریکە گریانیان دێ، ئاخر چی بووە؟
کاتژمێر نۆو نیوە
هیچ کات ئەوان
ئەوەندە درەنگ نەدەهاتن؟
ئەو داماوانە، چی بکەن؟ نازانن.
هەندێك دادەنیشن و کتێب دەخوێننەوە
هەندێکیان مشکان دەماڵن
ئەوش جۆرە سەرقاڵیەکە
ئێمەی جادووگەر هاوار دەکەیین
ئافەرین هوڕیاو! ئافەرین هوڕیاو!



# ڕێسای کار

هیوادارم لەبیرتان نەکردبێ، لەو ماوەیەدا لەسەر چۆکان دانیشتبووم و لە کەلێنی پەردەکەوە سەیرم دەکرد. نازانم چەندی خایاند، بەڵام هەستم دەکرد ئەو مەسەلەیە هەرگیز تەواو نابێت. لە هەمووش ناخۆشتر ئەوە بوو نەمدەتوانی نە بکۆخم و نە بپشمم، چونکە ئەگەر دەنگێکم دەرهێنابا، کارم تەواو بوو.

لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لە ترسان ئاگام لەخۆ نەبوو، نەکا یەکێك لە جادووگەرانی ریزی پشتەوە بەو کونە لوتە سەیر و سەمەرەانەوە بۆن بکات.

بە رواڵەت تەنیا شانس و بەختێکی هەمبوو، ئەوە بوو چەند رۆژ دەبوو خۆم نەشوشتبوو. ئەویتر ئەوە بوو ئەوان لە خۆشیان بەردەوام چەپڵەیان لێدەدا و هاواریان دەکرد و هەموو بیر و هۆشیان لای جادووگەری مەزن بوو کە لەو سەرەوە، لەسەر سەکۆیەکە راوەستابوو و پلانی بۆ لە ناو بردنی منداڵانی بەریتانیا دادەنا. بەدڵنیاییەوە ئەوان بە تەما نەبوون، هەست بە بوونی منداڵێك بکەن لە ناو ژوورەکەدا. شتێکی ئەوها لە خەونیشدا (ئەگەر جادووگەران خەون

ببینن) بە مێشکیاندا نایەت. هیچ دەنگێکم لێ دەرنەدەهات و بەردەوام دوعام دەکرد.

ئاوازی ناخۆش و بە زەوقی جادووگەری مەزن تەواو بوو. ئامادەبووان وەك شێتان چەپڵەیان لێدەدا و هاواریان دەکرد، بێ وێنەیە، لەرادەبەدەرە، نایابە، ئەی بیرمەند، تۆ یەك بەلیمەتی! ئەو چالاکیە هەنگاو بە هەنگاوەی تۆ داهێنانێکی زۆر شادی هێنە، لە هەمووش خۆشتر ئەوەیە کە مامۆستایەکان بۆخۆیان ئەو منداڵە بۆگەنیوانە لە ناو دەبەن و ئێمە لەمبارەوە هیچ کارێکمان پێ نین! ئێمە هەرگیز لەگیر ناکەوین!

جادووگەری مەزن بە توڕەیی و زاڵێتی یەوە وتی، جادووگەرررەکان هەرگیز لەگیر ناکەون! ئێستا سەرنج بدەن! هەمووتان زۆر بە باشی هۆشتان لێرە بێ، چونکە دەمەوێ فرررموڵ و یاسای چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی دروستکردنی مشك ژمارە ٨٦ تان بۆ شیبکەمەوە!

لەپڕ هەناسەدانێکی سەیر لە هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە. هات و هاوار و قاو قیژی جادووگەران بەرز بۆوە. جادووگەران لە شوێنەکانیان دەرپەڕین و لە کاتێکدا بە پەنجە ئیشارەتیان بۆ سەر سکۆیەکە دەکرد، هاواریان کرد، مشك! مشك! ئەو دەیەوێ چونیەتی دروستکردنی مشکمان نیشان بدات.

ئەو بیرمەندە دوو منداڵی کردۆتە مشك و لەگەڵ خۆیدا هێناونی بۆ ئێرە!

سەیری سەر سکۆیەکەم کرد. بەڵێ، لەسەر سەکۆیەکە دوو مشك لە دەوروبەری تەنورەی جادووگەری مەزن دەهاتن و دەچوون. بەڵام ئەو مشکانە، مشکی ناو مەزرا، یا مشکی ناو ماڵ، یا مشکی ناو سەحرا و بیابان، یان مشکی ناو کۆگا نەبوون. مشکی سپی بوون. خێرا **ویلیام و مێریم** ناسینەوە.

ئامادەبووان هاواریان کرد، مشك! رابەرمان بۆ کۆبوونەوەکە دوو مشکی بە دیار خستن! تەڵە مشك بێنن! پەنیریشی لە ناو باوێن!

جادووگەری مەزن چاوی لەبەر پێی خۆیەوە بڕیبوو و بە سەرسامی و سەرسوڕمانێکی زۆرەوە سەیری **ویلیام و مێری** کرد. دووڵا هاتەوە و لە نزیکەوە سەیری کردن. دوایی هەستایەوە و هاواری کرد، بێدەنگ!

ئامادەبووان بێدەنگ بوون و لە شوێنی خۆیان دانیشتن.

ئەو هاواری کرد، ئەو مشکانە هیچ پەیوەندیان بە منەوە نییە! ئەو مشکانە راهێنراون! ئاشکرایە ئەو مشکانە هی منداڵێکی بێزارکەرن کە لە ناو ئەو هوتێلەدایە! و بە دڵنیاییەوە هی کوڕێکین، چونکە کچەکان مشك ڕاناگرن!

جادووگەران هاواریان کرد، کوڕێك! کوڕێکی پیس و بۆگەن! ئێمە لە ناوی دەبەین! هەلا هەلای دەکەین و دەیخۆینەوە! ورگ و ریخۆڵەکانی لەگەڵ نانی بەیانی دەخۆین!

جادووگەری مەزن دەستی بەرز کردەوە و هاواری کرد، بێدەنگ! ئێوە باش دەزانن نابێ کارێکی وا بکەن و سەرنجی کەسانێك بۆ لای خۆتان ڕاکێشن! بەدڵنیاییەوە ئێمە دەردی ئەو منداڵە بچووك و بۆگەنە دەرمان دەکەین، بەڵام تا ئەو جێیەی دەکرێ، دەبێ بە بێدەنگی ئەو کارە ئەنجام بدەیین.

بۆدەنا لەبیرتان کردووە، کە ئێمەی خانمانی بەرێز، ئەندامی ئەنجومەنی پاشایەتی پێشگیری لە ئەنجامدانی زوڵم و ستەمین لە بەرامبەر منداڵان؟

جادووگەران هاواریان کرد، ئەی مێشکی بیرمەند، ئێوە چ پێشنیارێکتان هەیە؟ ئێمە بە چ شێوەیەك دەبێ ئەو پیس و چەپەڵە لە کۆڵ خۆمان بکەینەوە؟

بە خۆمم وت، ئەوانە لەبارەی منەوە قسە دەکەن. ئەو بوونەوەرە مێیانە پلان دادەنێن بۆ کوشتنم. هەموو لەشم وەسەر ئاو گەڕا.

جادووگەری مەزن رایگەیاند، هەررر کەسێکی دەبێ با ببێ، هیچ گرنگیەکی بۆ ئێمە نییە، بە منی بسپێرررن. بۆن دەکەم و دەیدۆزمەوە و دەیکەم بە ماسیەکی خاڵدار و بۆ نانی نیوەڕۆ دەیخۆم.

جادووگەران هاواریان کرد، ئافەرین! سەر و کەلکی بپەڕێنن و لە رۆنەکەرەدا سووری کەنەوە!

باش دەزانن هیچکام لەو شتانە نەیاندەتوانی خۆشحاڵکەر بن.

**ویلیام و مێری** لەسەر سەکۆیەکە هەر لە هاتوچۆ دابوون.



جادووگەری مەزن بە پەنجەکانی نیشانەگیری کرد و شەقێکی قایمی لە **ویلیام** هەڵداو هەڵیدا بۆ هەوای. دوا بە دوای ئەو **مێریشی** هەڵدا بۆ هەوای. ئەی لەو نیشانەگیریەی! ئەو دەیتوانی ببێتە یاریزانێکی باش.

مشکەکان بە دیوارەکە کەوتن و بە بێ هیچ جووڵەیەك بەر بوونەوە سەر ئەرزی. دواتر هەستانەوە و بە خێرایی دەستیان کرد بە ڕاکردن. جادووگەری مەزن هاواری کرد، ئاگادار بن چیتان پێ دەڵێم! دەمەوێ چۆنیەتی دروستکردنی یاسای هەنگاو بە هەنگاوی ژمارە ٨٦ (دروستکردنی مشك) تان بۆ شیبکەمەوە! قەڵەم و کاغەزەکانتان دەربێنن.

هەموویان سەری کیفەکانیان کردەوە و دەفتەرەکانیان دەرهێنا. ئامادەبووان بە بێ سەبریەوە هاواریان کرد، ئەی مێشکی بیرمەند چۆنیەتی دروستکردنەکەمان پێ بڵێ! کۆدی ئەو فرمولەمان پێ بڵێ.

جادووگەری مەزن وتی، یەکەم جار شتێکم دۆزیەوە کە منداڵەکان زۆر بە خێرایی بچووك و بچووکتر بکاتەوە.

ئامادەبووان وتیان، چ شتێك؟

جادووگەری مەزن وتی، ئەو بەشەی کارررەکە ئاسان بوو. ئەگەررر بتانەوێ منداڵێکی زۆر بچووك بکەنەوە، تەنیا دەبێ لە قووڵایی تلسکۆپەوە سەیری بکەن.

ئامادەبووان وتیان، ئێوە یەك موعجیزەکارن! هیچ کەسێك شتی ئەوهای بە مێشکیدا نایەت!



جادووگەری مەزن بەردەوام بوو، کە وابوو بنی تلسکۆپێك دێنن و ئەوەندەی دەکولێنن تا نەرم دەبێ.

جادووگەرەکان پرسیان، چەند دەخایەنێ؟

جادووگەری مەزن وەڵامی دایەوە، بیست و یەك کاتژمێر دەبێ بکوڵێ و لەو ماوەیەدا دەبێ چل و چوار مشکی قاوەیی بگرن و کلکیان بە چەقوی تیژ لێ کەنەوە.

دواتر دەبێ ئەوەندە لە ناو رۆنی موودا سووریان بکەنەوە تا بە تەواوی ببرژن.

جادووگەران پرسیان، ئەو هەموو مشکە کلك براوانە چی لێ بکەیین؟

یەك کاتژمێر لە ناو گوشراوەی بۆقدا بە ئارامی بیکولێنن. بەڵام بزانن چی دەڵێم. کارەکەمان تاکو ئێرە زۆر ئاسانە. بەشی گرنگ و قورسی کارەکە، بەکار هێنانی ئەو شتەیە کە وردە وردە کاریگەر دەبێ. شتێك کە منداڵەکان لە رۆژێکی دیاریکراودا بیخۆن و تا کاتژمێر نۆی رۆژی دواتر کە دەچنەوە بۆ قوتابخانە، هێشتا هەر کاریگەر نەبووبێ.



جادووگەران بە دەنگی بەرزەوە وتیان، ئەی مێشکی بیرمەند پێمان بڵێ چۆنت ئەو شتە بەدەست هێناوە؟ ئەو نهێنیە گەورەمان بۆ ئاشکرا بکەوە!



جادووگەری مەزن بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە رایگەیاند" نهێنیەکە، کاتژمێرێکی زەنگدارە!

جادووگەران هاواریان کرد، کاتژمێری زەنگدار! ئەی لەو بلیمەتیەی!

جادووگەری مەزن وتی، بەڵێ، بەم شێوەیەیە، ئێوە دەتوانن کاتژمێرەکە ئەورۆ لەسەر کاتژمێر نۆ کۆک بکەن تا سبەی بەیانی لە هەمان کاتژمێر کۆکەکەی تەواو بێ.

ئامادەبووان هاواریان کرد، کە وابوو ئێمە بە پێی ژمارەی منداڵەکان، کاتژمێری زەنگدارمان پێویستە، واتە پێنج ملیۆن کاتژمێر!

جادووگەری مەزن نەڕاندی، ئەی بێ مێشك و گێلینە! مرۆڤ بۆ دروستکردنی بابۆلەیەك خۆ تەواوی مانگایەکان ناکوژێ! کاتژمێری زەنگداریش ئەم حاڵەتەی هەیە. هەزارر منداڵ کاتژمێرێکیان بەسە.

ئێوە دەبێ کاتژمێرەکە بە شێوەیەك کۆك بکەن کە کاتژمێر نۆی بەیانی ڕۆژی دواتر کۆکەکەی تەواو بێت. دوایی بیخەنە ناو فڕنی غاز تا بە جوانی سوور بێتەوە. نووسیتان؟

جادووگەران هاواریان کرد، خەریکی نووسینین گەورەم!

جادووگەری مەزن وتی، دوایی تلسکۆپی کولێوو کلکە سووررر کراوەکانی مشکەکان و مشکە کولێوەکان و کاتژمێرە زەنگدارە سوورکراوەکان بەیەکەوە بکەنە ناو قاپێك و بە خێرایەکی زۆرەوە تێکیان هەڵشێلن.





هەویرێکی باشتان دەست دەکەوێ. لە کاتی تێکەڵکردنی ئەو شتانە، زەرررردێنەی هێلکەی غرغروشی (جۆرە باڵندەیەك) بە سەرداکەن.

جادووگەران هاواریان کرد، هێلکەی غرغرو! زۆر باشە!

لە ناو ئەو هەموو هات و هاوار و قاو قیژەدا، گوێم لە دەنگی یەکێك لە جادووگەرانی ریزی پشتەوە بوو، کە بە جادووگەرەکەی تەنیشتی دەوت، ئیتر من زۆر پیر بووم، ناتوانم بە درەختەکاندا سەر کەوم، ئەو غرغروە ناشیرنانە



هێلانەکانیان لەسەر ترۆپکی دارەکان دروست دەکەن.

جادووگەری مەزن بەردەوام بوو، زەردێنەکەی لەگەل تێکەڵ بکەن و دوایی ئەو شتانەی یەك لە دوای یەك پێوە زیاد بکەن: پەنجەی چەنە باز، دەنووکی تێرنەخۆرە، خەرتومی بێ چاورو و زمان درێژ.



هیوادارم ئەو شتانەتان بە ئاسانی دەست کەوێ.

جادووگەران هاواریان کرد، کێشە نییە، چەنەبازی بە نێزە ڕاو دەکەین، تەڵەی بۆ تێرنەخۆرە دادەنێین، زمان درێژیش دەدەینە بەر گوللە، و بێ چاو و ڕووش لە ناو کونەکەیدا لە گیرداوێین!

جادووگەری مەزن وتی، زۆر باشە!

دوای ئەوەی کە هەموو شتەکانتان لە ناو خەڵاتە بە باشی تێکەڵ کرررد، شلەیەکی ڕەنگ جوان و سەوزی لێ دەردەچێ. دلۆپێك، تەنیا یەك دلۆپی بچووك بکەنە ناو شیرینی و چکولیاتەکان، سبەی کاتژمێر نۆی بەیانی ئەو منداڵەی خواربێتی لە ماوەی بیست و شەش چرکەساتدا دەبێ بە مشك! بەڵام دەبێ زۆر وریا بن. هیچ کات ئەندازەکەی زیاد نەکەن. هیچ کات لە یەك دلۆپە زیاتر مەکەنە ناو شیرینی و چکولیاتەکان. بە هیچ منداڵێکیش لە یەك شیرینی و چکولیات زیاتر مەدەن. ئەگەر لە دلۆپێکی زیاتر تێبکەن، بەرنامەی چالاکی هەنگاو هەنگاو تێکدەچێ و منداڵەکە زووتر لە کاتی دیاریکراو دەبێتە مشك. لەوانەیە کاریگەریەکەی خێرا بێ، پێموانییە هیچ کامتان ئارەزووی خێرایی و دەست و بردتتان هەبێ، ها؟ ئێوە خۆ ناتانەوێ منداڵەکان هەر لەوێ، لە ناو دوکانەکەدا ببن بە مشك؟

ئەو کارررە خۆشی گەمەکەی لە ناو دەبات، کە وابوو زۆر وریا بن و زیاتر لە ئەندازەی خۆی بەکار مەهێنن!

# برۆنۆ جێنکینز بزر دەبێ

جادووگەری مەزن دووبارە وتی، ئێستا دەمەوێ پێتان بسەلمێنم کە ئەو رێسایە بە تەواوی کاریگەرە. خۆ ئەوەش دەزانن، کاتژمێرەکەی دەتوانن بە خواستی خۆتان بۆ هەر کاتژمێرێکی پێتان خۆش بوو کۆك بکەن. پێویست ناکات هەمیشە لەسەر کاتژمێر نۆ کۆکی بکەن. لەبەر ئەوە دوێنێ بۆ خۆم هەندێکم لەو فررمولە سیحراویە تێکەڵ کرد تا نیشانتان بدەم. تەنیا گۆڕانکاریەکی بچووکم لە چونیەتی دروستکردنەکەیدا ئەنجامدا. پێش سوورکردنەوەی کاتژمێرە زەنگدارەکە، لە جیاتی بۆ کاتژمێر نۆی بەیانی رۆژی دواتری کۆك بکەم، بۆ سێ و نیوی دوانیوەڕۆم کۆك کرد. واتە سێ و نیوی دوانیوەڕۆی ئەمڕۆ. دواتر سەیرێکی کاتژمێرە دەستیەکەی کرد و وتی، واتە رێك حەوت خولەکی تررر.

ئامادەبووان زۆر بە جیدی و بە زەوقەوە گوێیان لێ راگرتبوو، و هەستیان دەکرد رووداوێکی سەیر روو دەدات.

جادووگەری مەزن پرسیاری کرد، دەتانەوێ بزانن دوێنێ بەو شلە سیحراویە چیم کردووە! ئێستا پێتان دەڵێم. ئەوم کردە ناو بەستەیەك چکولیاتی تورت و خۆش و دام بە کوڕێکی بۆگەنیوی هێلنج هێنەر کە لە ناو هۆڵی هوتێلەکەدا دەسوڕایەوە.

جادووگەری مەزن وچانێکی دا.

ئامادەبووان لە بێدەنگیدا چاوەڕوانی بەردەوام بوونی قسەکانی بوون.

دوای ئەوەی کە ئەو تولە بۆگەنیو و هێلنج هێنەرە چکولیاتەکەی حەپەلوش کرد، لێم پرررسی، خۆش بوو؟ وتی، زۆر. پێموت، دەتەوێ دیسان لەوانەت بدەمێ؟ وتی، بەڵێ. وتم، سبەینێ کاتژمێر سێ و بیست و شەش خولەك وەرە بۆ هۆڵی مۆسیقا تا شەش دانەی ترت لەو چکولیاتانە بدەمێ. ئەو نەوسن و چلێسە هاواری کرد، شەش دانە، باشە. دێم. دڵنیابە دێمەوە. جادووگەری مەزن هاواری کرد، لەبەر ئەوە، ئێستا هەموو شتێك ئامادەیە. ئیتر شتێکی وا بۆ تاقیکردنەوەی شیرینیەکە نەماوە! لەبیرتان نەچێ کە من دوێنێ کاتژمێرە زەنگدارەکەم بۆ کاتژمێر سێ و نیوی ئەوڕۆ کۆك کردووە. ئێستا کاتژمێر سێ و نیوە. دووبارە سەیرێکی کاتژمێرەکەی کردەوە و وتی، ئێستا رێك سێ و بیست و نۆ خولەکە و ئەو تولە بۆگەنیوە تا پێنج خولەکی تر دەبێتە مشك. ئێستا دەبێ لە پشت دەرررگاکە بێت.

بە خوا هەموو قسەکانی راست بوو. کوڕێك کە دەبوایە ئەو بێ، خەریکی سوڕاندنی دەسکی دەرگاکە بوو و بە مستان لە دەرگاکەی دەدا.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، زووکەن! پرچە دەستکردەکانتان بکەنەوە سەرتان! دەستکێشەکانتان لە دەست بکەنەوە. پێلاوەکانتان لە پێ کەنەوە!

هات و هاوار و خشه خشێکی سەیر بۆ لەسەر کردنی پرچەکانیان و لە پێ کردنی پێڵاوەکان و لە دەستکردنی دەستکێشەکانیان دەستی پێکرد. جادووگەری مەزنیش نیقابەکەی هەڵگرت و لەسەر ئەو دەموچاوە هێلنج هێنەرەی دانا. زۆر سەیر بوو کە ئەو نیقابە جادووگەرەکەی لەو رووی بەو رووەی دەکرد، و لە ماوەی یەك خولەکدا دەیکردە خانمێکی گەنج و جوان.

دەنگی کوڕەکە لە پشت دەرگاکەوە بەرز بۆوە، دەرگاکە بکەوە، ئەی کوا ئەو شەش بەستە چکولیاتانەی بەڵێنت دا بمدەیەی؟ هاتووم لێت وەربگرم! زووکە دەرگاکە بکەوە!

جادووگەری مەزن وتی، نەك هەر بۆگەنیوە، نەوسنیشە. زنجیرری دەررگاکە لابەن و رێگە بدەن بێتە ژووررەوە.



سەیرەکە لەوەدا بوو لێوەکانی نیقابەکە لە کاتی قسە کردنیدا جوڵەکەیان زۆر ئاسایی بوو و هیچ پێوەی دیار نەبوو ئەوە یەك نیقابە.

یەکێك لە جادووگەران لە شوێنی خۆی هەستا و زنجیری دەرگاکەی لابرد و دەرگاکانی کردەوە. دەنگی ئەو بەرز بۆوە، هەی لۆلە، سەلام بچکۆلە، بە دیتنت زۆر خۆشحاڵم. هاتووی چکولیاتەکانت وەربگری؟ هەموویان ئامادەن. وەرە ژوورەوە.

کوڕێکی بچووك کە بلوزێکی تەنك و سپی و پانتۆڵێکی خۆڵە مێشی و جووتێك پێڵاوی وەرزشی لەبەر بوو، هاتە ژوورەوە. یەکسەر ناسیمەوە. ناوی برۆنۆ جێنکینز بوو لەگەڵ دایك و باوکی لە ناو هوتێلەکە بوون. ئەمن هەر گوێم نەدەدایە. لەو منداڵانە بوو کە هەمیشە زاریان دەجووڵێ، یا پارچە کێکێکی ئیسفنجی لە زاری دابوو، و یا لە ناو هۆڵی هوتێلەکەدا دەسوڕایەوە، و یا بە چەنگان چیپسی لە زاری دەکرد، و یا لە ناو باغی هوتێلەکەدا دەگەڕا، و لێگدا لێگدا چکولیاتی شیری تێداخنی دوو بەستەشی لە ناو باخەڵی هاویشتبوو. لەوەش زیاتر بەردەوام پۆزی بەسەردا لێدەدام ، کە هەم باوکی لە باوکی من زیاتر پارە پەیدا دەکات و هەمیش سێ سەیارەیان هەیە. لە هەمووش خراپتر دوێنێ بەیانی دیتم لە هەیوانی هوتێلەکە لەسەر چۆکان دانیشتوە وگەردبینێکی بە دەستەوە. ریزێك مێرولە لەسەر یەکێك لە بەردەکانی هەیوانەکە دەڕۆیشتن و برۆنۆ گەردبینەکەی روو بە رۆژ گرتبوو مێرولەکانی یەك یەك دەکردن بە کەباب. پێیوتم، بە سەیرکردنی سوتانیان خۆشحاڵ دەبم. هاوارم کرد، زۆر ترسناکە! دواتر بە هەموو هێزی خۆم پاڵم پێوەنا و هەڵمدایە سەر ئەرزەی هەیوانەکە. گەردبینەکەی پارچە پارچە بوو و هەستایەوە و هاواری کرد، لەبەر ئەو کارەت باوکم دەردت دەرمان دەکات!

دوایی وابزانم رۆیشت تا باوکە دەوڵەمەندەکەی بدۆزێتەوە. ئەوە دوایین جار بوو برۆنۆ جێنکینز ببینم. نەمدەتوانی بڕوا بکەم کە بڕیارە ئێستاکە ببێتە مشك. بەڵام دەبێ دانیپێدا بنێم کە لە دڵەوە، ئەو مەسەلەیەم پێ ناخۆش نەبوو. لە لایەکی ترەوە، نەمدەویست لەبەر چاوی ئەو هەموو جادووگەرە ئابڕووی بچێ.

جادووگەری مەزن لەسەر سەکۆیەکە بە میهرەبانیەوە وتی، وەرە رۆڵە گیان، ئەوش چکولیاتەکانت. یەکەم جار وەرە سەلامێك لەو خانمە میهرەبانە بکە. دەنگی تەواو گۆڕابوو. نەرم و هێدی و دروست لە هاتنە خوارەوەی ئاوی تاڤگە دەچوو.



پێدەچوو برۆنۆ کەمێك گێژ بوو بێ، بەڵام هەر چۆنێك بوو، رۆیشتە سەر سەکۆیەکە و لە تەنیشت جادووگەری مەزن راوەستا و وتی:

زۆر باشە، ئەی کوا ئەو شەش بەستە چکولیاتەکە؟

ئەو جادووگەرەی دەرگاکەی کردبۆوە، بە بێ دەنگی دووبارە زنجیرەکەی پێدا کردەوە. برۆنۆ هۆشی بەوەندە لە لای چکولیاتەکان بوو کە ئاگای لە دەرگاکە نەما.

جادووگەری مەزن رایگەیاند، ئێستا خولەکێکی ماوە بۆ کاتژمێر سێ و نیو!

برۆنۆ پرسی، بڕیارە کاتژمێر سێ و نیو چی رووی بدات ؟ ترسانی پێوە دیار نەبوو، بەڵام زۆریش ئارام نەبوو. وتی، ئەوە چییە؟ چکولیاتەکانم بدەیە!

جادووگەری مەزن باسکی برۆنۆی گرت و هاواری کرد، سێ چرکەسات! برۆنۆ جوڵەیەکی کردو تێیەوەڕاما. ئەویش لە برۆنۆوە ڕامابوو و بە لێوی نیقابەکەی زەردەخەنەیەکی کرد. هەموو ئامادەبووان لە برۆنۆوە ڕامابوون.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، بیست چرکەسات!

لەپڕ برۆنۆ وەشك کەوت و هاواری کرد، چکولیاتەکەم بدەیە! چکولیاتەکەم بدەیە و رێگە بدە برۆم!

جادووگەری مەزن هاواری کرد، پازدە چرکەسات!

برۆنۆ هاواری کرد، یەکێك لە ئێوەی شێت و چەپەڵ پێم بڵێ ئەو گاڵتەجاڕیە چییە؟

جادووگەری مەزن هاواری کرد، دە چرکەسات!

نۆ... هەشت... حەوت... شەش... پێنج... چوار... سێ ... دوو... ئاگر!

ئامادەم سوێند بخۆم کە گوێم لە دەنگی کاتژمێرێکی زەنگدار بوو. برۆنۆ لە جێی خۆی دەرپەڕی. وەك ئەوەی دەرزیان تێڕاکردبێ، هاواری کرد، ئاخ! وادەرپەڕیە سەرەوە کە سەری بە سەقفەکە کەوت، لە کاتێکدا دەستەکانی رادەوەشاند و لەبەر زۆری ئازارەکەی دەینەڕاند، کەوتە سەر مێزێك کە لەسەر سەکۆیەکە بوو. دواتر لەپەڕ لە دەنگ کەوت و جەستەی رەق و تەق بوو.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، کاتژمێرەکە هەرس بووە! یاسای دروستکردنی مشك خەریکە کاری خۆی دەکات! دواتر لەسەر سەکۆیەکە کردی بە هەڵبەز و دابەز و دەستە دەستکێش پۆشەکانی لێك راکێشا و هاواری کرد:

تا چەند چرکەیەکی تر

ئەو تولە بۆگەنیوە، ئەو زبلّ و پاشماوە

ئەو ئەسپیّ ترسناکە

دەبێتە مشکێکی بچووك و ژیکەلە!

برۆنۆ چرکە بە چرکە بچووکترو بچووکتر دەبۆوە و بەرە بەرە کورت دەبۆوە...

دواتر جلەکانی بزر بوو و لە جیاتان تەواوی جەستەی بە توکێکی قاوەیی داپۆشرا...

لەپڕ کلکی دەرکرد...

دوایی سمێلی دەرکرد...

دواتر چوار پێی پەیدا کرد...

ئەو رووداوانە زۆر بە خێرایی روویدا...

چەند چرکەساتی زیاتر نەخایاند...

ئیتر برۆنۆ شوێنەواری نەما..

مشکێکی بچووك و قاوەیی لەسەر مێزەکە بەولاو بەولایاندا ڕایدەکرد

ئامادەبووان هەستانە سەر پێ و هاواریان کرد، ئافەرین! کوڕەکەی کردە مشك! شلەکە کاریگەری هەیە! زۆر نایابە! بێ وێنەی! ئەی مێشکی بیرمەند، تۆ یەك مۆعجیزەکەری! ئەوان چەپڵەیان لێدەداو لە خۆشیان هاواریان دەکرد، جادووگەری مەزن تەڵە مشکێکی لە ژێر جلەکانی دەرهێناو لەسەر مێزەکەی دانا.

بە خۆمم وت، ئەی نا! ئەوە چییە. لەوانەیە برۆنۆ جێنکینز کەمێك قێزەون بوو بێ، بەڵام هەرگیز ئامادەنیم، شاهیدی پەڕاندی سەری بم.

جادووگەری مەزن لە کاتێکدا لەسەر سەکۆیەکە دەگەڕا بە توڕییەوە دەینەڕاند چوو بۆ کوێ؟ ئەو مشکە لە کوێ غەیب بوو؟

ئەو نەیتوانی برۆنۆ بدۆزێتەوە.

سپاس بۆ خوا. برۆنۆ بە زیرەکییەوە لەسەر مێزەکە خۆی هەڵدابوو خوارێ و لە گۆشەیەك خۆی بزر کردبوو، لەوانەشە خۆی لە کونێکدا حەشاردابێ.

جادووگەری مەزن هاواری دەکرد، ش مانایەکی هەیە؟ بێدەنگ دانیشن بزانم!

# جادووگەرانی دێرین

جادووگەری مەزن لە ناوەراستی سەکۆیەکە راوەستابوو و بە چاوە
مەترسیدارەکانی، سەیری جادووگەرانی تری دەکرد کە بەو سەر و سەکوتە گاڵتەجارِیە لە بەرامبەری دانیشتبوون. لەپرِ نەرِاندی ئەوانەی لەسەرووی حەفتا ساڵن، دەستیان بەرز بکەنەوە!
حەوت هەشت دەست بەرز بوونەوە.
جادووگەری مەزن وتی، بیستومە کە ئێوە جادووگەرە دێرینەکان، توانای ئەوەتان نییە بۆ دۆزینەوەی هێلکەی غرغرو لە درەخت سەر کەون.
جادووگەرە دێرینەکان بە یەکەوە وتیان، راستە گەورەم! ئێمە ناتوانین لە درەخت سەرکەوین، دەترسین!
جادووگەری مەزن بەردەوام بوو، بەدڵنیاییەوە ناتوانن تێرنەخۆرەش بگرن، چونکە لەسەر هەڵدێری بەرز دەژی، پێموانییە بە دوای ئەو بێ چاو و رووە تیژرِەوەشدا بتوانن رِابکەن و خۆ هەڵدەنە ناو دۆڵە قووڵەکان و تیری بە چەنە

بازەوە بنێن، یا تفەنگ بگرنە دەست و بڕۆن بۆ ناو زەویەکان و ڕاوی زمان درێژ بکەن. ئێوە بۆ ئەو کارانە زۆر پیر و لاوازن.

جادووگەرە دێرینەکان بە یەکەوە وتیان، ئێمە پیرین! ئێمە پیرین! ئێمە پیرین!

جادووگەری مەزن وتی، ئێوە جادووگەرررە دێرینەکان ساڵانێکی زۆررر کارررو خزمەتتان بە من کردووە، نامەوێ ئێوە لەبەر پیری و لاوازی لە خۆشی بیستنی دەنگی تەق و تۆقی کەڵە سەری چەند هەزار منداڵ بێ بەش بکەم.



لەبەر ئەوە بە دەستی خۆم بڕێکی کەمم لەو فررموڵە دروست کردووە، پێش ئەوەی لێرە بڕۆم، لە ناو جادووگەرە دێرینەکاندا دابەشی دەکەم.

جادووگەرە پیرەکان هاواریان کرد، ئاخ، سپاست دەکەین، زۆر سپاست دەکەین! زۆرت ئاگا لە ئێمەیە گەورەم! ئەتۆ زۆر میهرەبانی، بیر لە هەموو شتێك دەکەیەوە.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، ئەوە نموونەیەکی بچووکە لەو کارانەی بۆ ئێوەی دەکەم. دوایی دەستی لە باخەڵی جلەکانی ڕاکرد و شوشەیەکی زۆر بچووکی دەرهێنا. بەرزی کردەوە و هاواری کرد، لە ناو ئەو شوشە بچووکەدا پێنسەت

خوارردنی دروستکەری مشکی تێدایە! کە بەشی مشك کرردنی پێنسەت منداڵ دەکات! رەنگی شوشەکە شینێکی تۆخ بوو، و زۆریش بچووك بوو، وەك شوشەی قەترەی لوتی، کە لە دەرمانخانەکاندا دەیانفرۆشن. ئەو هاواری کرد، دوو لەو شوشانە دەدەم بە هەر یەکێك لە ئێوە جادووگەرە دێرینەکان! جادووگەرە دێرینەکان بە یەکەوە وتیان، سپاست دەکەین! ئەی گەورەی بە دەست و دڵ و دڵسۆز! ئێمە یەك دڵۆپەش خەسار ناکەین! بەڵێن دەدەین هەر یەکەمان هەزار منداڵ پان و پلچ و ورد و هاڕو لەت و پەت کەین و وەك قیمە تێکیان هەڵشێلین.

جادووگەری مەزن رایگەیاند، کۆبوونەوە تەواو بوو! ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خۆتان بە کارمەندەکانی ئوتێلەکە نیشان بدەن.

ئێستا هەڵدەستین و دەچینە رۆژێ لە بەر هەیوانەکە، تا لەگەڵ بەڕێوەبەری بێ هاوتای ئوتێلەکە چای بخۆینەوە. دوایی، رێك کاتژمێر شەش، ئەو جادووگەرانەی پیر بوون و ناتوانن بە دوای هێلکەی غرغررو لە درەخت سەرکەون، دێنە ژوورەکەم تا یەکە و دوو شوشە وەربگرن. ژمارەی ژوورەکەم ٤٥٤ . لە بیری نەکەن.

دواتر، کاتژمێر هەشت، هەمووتان بۆ خوارردنی نانی ئێوارێ لە ژووری نان خواردن کۆدەبنەوە. ئێمە خانمانی بەرێز ئەندامین لە ج س ج س ك، و کارمەندەکانی ئوتێلەکە دوو مێزی گەورەیان بۆ داناوین. لە بیر نەکەن دەمامکەکانتان دابنێن. ژووری نان خواردن پڕە لە منداڵی بۆگەن، و بە بێ ئەو دەمامکانە کەس توانای خۆڕاگرتنی نییە.

وریا بن لەو ماوەیەدا زۆر ئاسایی رەفتار بکەن. هەموو شتێك روون و ئاشکرایە! کەس پرسیارری نییە؟

دەنگی یەکێك لە ئامادەبووان بەرز بۆوە، گەورەم، پرسیارێکم هەیە. ئەگەر کەسێکی گەورە لە چکولیاتەکەمان بخوات، چی روویدەدا؟

جادووگەری مەزن وتی، زۆر خراپ دەبێ بۆی. دوایی هاواری کرد، کۆبوونەوە تەواو بوو! هەستن بڕۆن!

جادووگەران هەستان و شتەکانیان کۆکردەوە. لە کەلێنی پەردەکەوە سەیرم دەکردن و خوا خوام بوو ئەوان زوو بڕۆن، تا منیش رزگارم بێ.

یەکێك لە جادووگەرانی ریزی پشتەوە هاواری کرد، سەبرکەن! لە شوێنی خۆتان مەجولێن! دەنگی ئەو وەکو دەنگی شیپور (زوڕنا) لە هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە. هەموو جادووگەران راوەستان و بۆ لای خاوەنی دەنگەکە ئاوڕیان دایەوە. ئەو جادووگەرێکی بالاّ بەرز بوو، کە لە ناوەڕاستی ژوورەکە راوەستابوو سەری خوار کردبۆوە و بەو دوو کونە لوتە خەتدارە بازنەیەکەی، کە لە نینۆکە شەیتانە دەچوو زۆر بە قوولّی بۆنی دەکرد.

دووبارە هاواری کرد، سەبرکەن!

ئەوانی تر هاواریان کرد، چی بووە؟



ئەو نەڕاندی.کشپل! بۆنی کشپلم بۆ دێت!

ئەوانی تر هاواریان کرد، بەدڵنیاییەوە هەڵەی! ئێرە کشپلی لێ نییە!

جادووگەری یەکەم هاواری کرد، بۆچی، بۆچی! دووبارە بۆنەکم کردەوە! زۆر بەهێز نییە! بەڵام هەیە! واتە هەر لێرە! دیارە لەو نزیکانە لە شوێنێکە!

جادووگەری مەزن لەسەر سەکۆیەکە چاوی لە خوارەوە بڕی و هاواری کرد، لەوێ چی روویداوە؟

یەکێك لە جادووگەران وەڵامی دایەوە، گەورەم، **میلدێرید** بۆنی کشپلی کردووە!

جادووگەری مەزن هاواری کرد، قسەی بێ مانا، خەون و خەیاڵە! لەو ژوورەدا هیچ منداڵێکی لێ نییە.

ئەو جادووگەرەی ناوی **میلدێرید** بوو، هاواری کرد، دەست ڕاگرن! هەمووتان بوەستن! لە شوێنی خۆتان مەجولێن! دووبارە بۆنەکەم بۆ هاتەوە!

کونە لوتە بە تۆق و خەتدارەکەی وەکو کلکی ماسی دەجولا. بۆنەکە زیاتر بوو! ئێستا زیاتر هەست بە بۆنەکەی دەکەم! ئێوە هەست بە هیچ شتێك ناکەن؟

لوتی هەموو جادووگەران بڵند بوو، و هەموو کونە لوتەکان دەستیان کرد بە بۆن کردن.

دەنگێکی تر بەرز بۆوە، ڕاست دەکات! وایە! بۆنی کشپل زۆر بە پیسی لێرەدا بڵاو بۆتەوە!

لە ماوەی یەك چرکەساتا، هاواری بۆنی کشپلە! بۆنی کشپلە، تەواوی جادووگەرانی ژوورەوەی گرتەوە. ئەوان هاواریان دەکرد، ژوورەکە پڕ بووە لە بۆنی کشپل! پف پف. ف ف ف!

جادووگەری مەزن هاواری کرد، بیدۆزنەوە! بە دوای بۆنەکەدا بگەڕێن و بزانن لە کوێوە دێ. ئەوەندە بۆن بکەن تا دەیدۆزنەوە!

قژەکانی سەرم وەکو دەسکی گەسك قیت ببۆوە و ئارەقەیەکی ساردم کرد.

جادووگەری مەزن نەڕاندی، زووکەن شوێنی ئەو تەپاڵەیە بدۆزنەوە! ڕێگە مەدەن ڕاکات! ئەگەر لێرە بێ، هەموو شتێکی بینیوە! دەبێ بە خێرایی لە ناو بچێ.

# گۆڕینی شێوە

دێتەوە یادم کە بە خۆمم وت، ئیتر دەرباز بوونم ناکرێ! ئەگەر بتوانم خۆشم دەرباز بکەم، دیسانیش ناتوانم لەو ژوورە بچمە دەرەوە، چونکە دەرگاکان بە قفل و زنجیر داخراون! ئیتر بۆم دەرچوو، تەواو بووم! ئەی، نەنە گیان! ئەوانە بە تەمان چیم لێ بکەن! سەرم بڵند کرد و جادووگەرێکی ناشیرین کە خۆی رازاندبۆوە تێمەوە ڕامابوو. جادووگەرەکە زاری کردەوە و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانەوە نەڕاندی، ئەوتا! لە پشت پەردەکە خۆی حەشارداوە! وەرن بیگرین! جادووگەرەکە دەستی دەستکێش پۆشی درێژ کرد و بە قژەکانمەوە بەرزی کردمەوە، بەڵام من سوڕامەوە و خۆم هەڵدایە ئەو لای. ئاخ، نازانن چەندەم ڕاکرد! ترس و لەرز پێیەکانمی وەك فرفرە هەڵدەسوڕاند! بۆ لای دەرگای هۆڵی مۆسیقا رۆیشتم، ئەوان نەیاندەتوانی بمگرن. گەیشتمە دەرگاکە و ویستم بیکەمەوە، بەڵام زنجیرە گەورەکەی هەر یەك میلیمیش ئەو لاو ئەو لای نەدەکرد.

جادووگەران خۆیان بە گرتنی منەوە ماندوو نەدەکرد. هەموو بەیەکەوە راوەستابوون و سەیریان دەکردم. چونکە دەیانزانی ریگەی دەرباز بوونم نییە. چەند لە جادووگەران بە پەنجە لوتی خۆیان گرتبوو دەیان قیژاند پیف ف ف! ئەی لەو بۆنەی! خۆی بۆ ڕاناگرین!

جادووگەری مەزن لە سەر سەکۆیەکە نەڕاندی، بۆچی نایگرررن ئەی بێ مێشکینە! بە دەوری ژوورەکەدا بڵاو ببنەوە و دەورەی لێدەن و بیگرن! ئەو گوللە چلك و پیسیەی لە گۆشەیەکدا لە گیر باوێن و بیگرن و بیهێنن بۆ سەرەوە بۆ لای من!

جادووگەران بە پێی فەرمانی ئەو بە دەوری ژوورەکەدا بڵاو بوونەوە. هەندێکیان لەو لایەی ژوورەکە، هەندێکیان لە لایەکەی تری ژوورەکە، هەندێکیش لە ناوە راستی ژوورەکە، بە ناو کورسیەکاندا لێم دەهاتنە پێشەوە. چی وا نەمابوو بمگرن. لە هەموو لایانەوە دەوریان دابووم. بە ترس و لەرزەوە دەستم کرد بە قیژاندن. هاوارم کرد، فریام کەون! سەرم بۆ لای دەرگاکە سوڕاند بەڵکو یەکێك گوێی لێ بێ و یارمەتیم بدات! فریام کەون! فریام کەون!

جادووگەری مەزن قیژاندی، بیگرررن! بیگرن! بێ دەنگی بکەن!

ئەوان بە بیستنی ئەو قسەیە هێرشیان بۆ هێنام و بە پێنج کەسان دەست و پێیان گرتم و بەرزیان کردمەوە. منیش هەر دەمقیژاند، یەکێکیان دەستی دەستکێش پۆشی لەسەر زاری دانام و بێ دەنگی کردم.

جادووگەری مەزن هاواری کرد، بیهێننە ئێرە! ئەو کرمە سیخوڕەی بێنن بۆ لای من! منیان بە دەست و پێی بەستراو، بردە سەر سەکۆیەکە و لە کاتێکدا دەموچاوم رووی لە سەقفەکە بوو، لە هەمان شوێن لە ناوەراستی زەوی و ئاسماندا ڕایانگرتم.



جادووگەری مەزن لە سەر سەرم راوەستابوو و بە حاڵەتێکی بێ ئەنداز ترسناك پێدەکەنی. شوشە بچووك و رەنگ شینی شلەی دروستکەری مشکی هەڵگرت و وتی، لەگەڵ کەمێك دەرمان چۆنی؟ لوتی بگرررن ناچاری بکەن زاری بکاتەوە!

چەند پەنجەی بەهێز لوتیان توند گرتم. منیش زارم پێکەوە نابوو هەناسەم نەدەکێشا. بەڵام ئەو کارە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوامی نەبوو. سینگم خەریك بوو دەتەقی. زارم کردەوە تا هەناسەیکی قووڵ هەڵکێشم، و هەر کە زارم کردەوە، جادووگەری مەزن هەموو ئەو شتەی لە ناو شوشەکەدا بوو لە زاری کردم!

ئاخ، چ ئازارێك، هەناوم ئاگری گرت! هەستم کرد کەتریەکی پڕیان ئاوی کولێو لە زاری کردووم. ئاگرم لە گەرووی دەهاتە دەر! دوای چەند چرکەسات ئەو هەستە کوشندە و ترسناکەی سوتانەوە و کولێوی بە سینگ و سك و دەست و لاق و هەموو جەستەمی گرتەوە! دەستم کرد بە قیژاندن، بەڵام دووبارە ئەو دەستە

دەستکێش پۆشە زاری گرتم. نازانم چۆنتان بۆ بگێرمەوە! پێستی جەستەم بە مانای واقعی وشەکە لە نوکی سەرمەوە تا بەری پێم توند و ڕەق ببوو و وردە وردە خڕ دەبۆوە! هەستم دەکرد بوومەتە فدبۆڵ و یەکێك سەرەکەی بادەدات و فدبۆڵەکەش بەردەوام بچووك و بچووکتر دەبێتەوە و چی وا نەماوە بتەقێ.

دواتر هەستم دەکرد دەگوشرێم. ئەو جارەی لەوە دەچوو دەستێکم جل لەبەر دایە کە لە ئاسن دروستکراوە، و کەسێك بڕغوەکەی بادەدا، لەگەڵ هەر بادانەی بڕغوەکە، جلە ئاسنیەکانیش بچووك و بچووکتر دەبێتەوە، تا ئەو رادەیە وەك ئەوەی هەنارێك بگوشی ئاو لە هەموو شوێنێکم هەڵدەڕژێ!

دوای ئەو هەستەی سوتان و خورانە ئاگرینەی کە لە سەرتاسەری پێستی جەستەم دروست ببوو (یا ئەو شتەی کە لە پێستی جەستەم مابۆوە)، هەستم دەکرد هەزاران هەزار دەرزی باریك و ورد بە ناو پێستمدا دەیکەنە ناو جەستەم. ئێستا تێدەگەم ئەو کاتە خەریك بوو توکم لێ دەهات، لە ماوەیەکی زۆر دوورەوە، گوێم لە دەنگی جادووگەری مەزن بوو کە دەینەڕاند، پێنسەت خۆراك! ئەو ئاودزو بۆگەنیوە پێنسەت قەترەی شلەی دروستکەری مشکی خواردووە و کاتژمێرە زەنگدارەکە ورد و هاڕ بووە و ئێستا ئێمە شاهیدی کاریگەری خێرای ئەو فررڕمولە دەبین! دەنگی چەپڵە و هاواری خۆشیان بەرز بۆوە. لە بیرمە بە خۆمم وت، من ئیتر بۆ خۆم نیم! ئیتر لە پێستی خۆم هاتوومە دەرێ. هەستم کرد دوو سانتیمەتر و نیوی ماوە لوتم بە کەفی ئەرزەکە بکەوێ.

هەستم کرد جووتێك پەنجەی بچووك و توکاوی لەسەر ئەرزەکەیە. دەمتوانی ئەو پەنجانە بجولێنم. ئەو پەنجانە هی من بوون!

لە هەمان کاتدا، هەستم کرد ئیتر کوڕێکی بچووك نیم. من ببووم بە مشك.

دەنگی هاواری جادووگەری مەزنم بیست. ئەوەش تەڵە مشك! و ئەوەش پارچەیەك پەنیرررر!

بەڵام بە تەما نەبووم راوەستم تا تەڵە مشکەکەی دێنن. وەك تیر دەپەڕیمە ئەو لای سەکۆیەکە! لە خێرایەکەی خۆم سەرم سوڕمابوو! بە یەك جوڵەی زیگزاکی بەسەر لاقی جادووگەراندا تێپەڕیم و لە چاو تروکانێکدا خۆم گەیاندە قادرمەکانی ژوورەیّ، بە خێرایی بە ناو کورسیەکاندا رۆیشتم . بە تایبەتی ئەوم پێخۆش بوو کە لە کاتی ڕاکردندا هیچ دەنگێکم لیّ نەدەهات، زۆر توند و تۆڵ و بە بیّ دەنگی هەڵدەهاتم و لەو پەڕی سەرسامیدا هەستم بە هیچ ئازارێك نەدەکرد. حاڵم تارادەیەك باش بوو. بە خۆمم وت، کاتێك ئەو هەموو ژنە ترسناك و خوێنخۆرە، مرۆڤیان دەور داوە، خراپ نییە مرۆڤ ئەوەندە بچووك ببێتەوە. خۆمم بە پایەی یەکێك لە کورسیەکانەوە نووساندبوو و بە ئارامی دانیشتم.



دەنگی هاواری جادووگەری مەزن لە دوورەوە دەبیسترا. کارررتان بەو پارررچە تەپاڵەیە نەبیٚ! جێگەی نیگەرانی نییە! ئەو ئێستا تەنیا مشکێکە! تا چەند خولەکێکی تر کەسێکی تررر دێت و دەیگریٚ! وەرن برۆینە دەرەوە! کۆبوونەوەکە تەواو بووە! دەرگاکان بکەنەوە و خۆتان لە سەر هەیوانەکە نیشان بدەن تا چای لەگەڵ بەڕێوەبەررره گێلەکەی ئوتێلەکە بخۆینەوە!

# برۆنۆ

سەرم لە پشت پایەی کورسیەکە هێنایە دەر و لاقی سەدان جادووگەرم بینی کە لە هۆلّی مۆسیقایەکە دەرۆیشتنە دەرێ. دوای ئەوەی هەموویان رۆیشتنە دەرەوە و هۆلّەکە بەتالّ بوو، بە نیگەرانیەوە خۆم خزاندەوە ژووریّ، لەپڕ برۆنۆم هاتەوە یاد. بەدلّنیاییەوە ئەوەیش هەر لەو نزیکانە بوو. بانگم کرد، برۆنۆ! چاوەڕوان نەبووم ئێستا کە بووم بە مشك، بتوانم قسە بکەم، لەبەر ئەوە، کاتێك گوێم لە دەنگی خۆم بوو و زانیم بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی و بەرز لە زارە بچووکەکەم دێتە دەر، زۆر سەرسام بووم.

دەنگەکە زۆر باش و نایاب بوو، لە خۆشیان نەمدەزانی چی دەکەم. دووبارە تاقیم کردەوە، برۆنۆ جێنکینز لە کویّ؟ ئەگەر گوێت لە دەنگمە، وەلاّمم بدەوە!

دەنگم رێك وەك ئەو کاتە بوو کە کوڕێکی بچکۆلە بووم. بانگم کرد، ئەهای، برۆنۆجێنکینز، ئەتۆ لە کویّ؟

هیچ وەلاّم نەبوو.

بۆ ئەوەی خۆم رابێنم لەگەلّ ئەو دووریە کەمەی هەمە لەگەلّ کەفی ژوورەکە، بە لۆژە لۆژ بە نێوان پایەی کەرسیەکاندا رۆیشتم. تێگەیشتم، ئەو دۆخەش ئەوەندە ناخۆش نییە. لەوانەیە پێتان سەیر بێ بۆچی هیچ پێی نیگەران نەبووم. یەکسەر بە

خۆمم وت، کوڕێکی بچووك بوون چ شتێکی باشی هەیە؟ کێ وتویەتی لە مشك بوون باشترە؟ دەزانم مشکەکان ڕاو دەکرێن و هەندێك جار ژەهرخوار دەکرێن و دەکەونە ناو تەڵە. بەڵام کوڕیش هەندێك جار دەکوژرێن. کوڕە بچووکەکان لە وانەیە بکەونە ژێر سەیارە و یا بە نەخۆشی کوشندە بمرن، بەڵام مشکەکان نا. مشکەکان ناچار بە تاقیکردنەوە نین. مشکەکان ناچار نین نیگەرانی پارە بن. تا ئەو جێیەی بزانم مشکەکان تەنیا دوو دوژمنیان هەیە، مرۆڤەکان و پشیلەکان. نەنکم یەك مرۆڤە، بەڵام دڵنیام، هەر شتێکی بم، هەمیشە خۆشی دەوێم. و سپاس بۆ خوا، هیچ کات پشیلە ڕاناگرێ. مشکەکان کاتێك گەورە دەبن، ناچار نین بڕۆن بۆ بەرەکانی شەڕ و لەگەڵ مشکەکانی تر بەشەڕ بێن. گومانی تێدا نییە مشکەکان یەکتریان خۆش دەوێ. بەڵام مرۆڤەکان نا.

بەخۆمم وت، بەڵێ، پێموا نییە مشك بوون شتێکی خراپ بێ.

لە ژووری مۆسیقا دەسوڕامەوە و بیرم لەو شتانە دەکردەوە کە چاوم بە مشکێکی تر کەوت. ئەو لەسەر زەوی دوولا هاتبۆوە و پارچە نانێکی بە پەنجەکانی گرتبوو و بە توندی ددانی پێدا دەدا.

بە مسۆگەری برۆنۆ بوو. وتم، سڵاو، برۆنۆ.

ئەو دوو چرکەساتێك سەیری کردم، دواتر دووبارە خەریکی خواردن بۆوە.

پرسیم، چیت دۆزیوەتەوە؟

وەڵامی دایەوە، ئەوە لە دەستی یەکێکیان کەوتە خوار، لەفەی ماسییە، زۆر بەتامە. ئەویش بە دەنگێکی زۆر ئاسایی قسەی دەکرد. مرۆڤ چاوەڕوانە دەنگی مشك (ئەگەر بە تەمای قسە کردن بێ) دەبێ زۆر لاواز و بە جیکە جیك بێ. زۆر پێکەنیناوی بوو کە دەنگی تارادەیەك گەورەی برۆنۆ لە گەرووی مشکێکی وردیلەوە دەهاتە دەرێ.

وتم، گوێ بگرە برۆنۆ، ئێستا کە هەردووکمان بووینەتە مشك، دەبێ وردە وردە بیر لە داهاتوومان بکەینەوە.

ئەو دەستی لە خواردن هەڵگرت و بەو چاوە ورد و رەشەکانیەوە تێمەوە ڕاماو وتی، مەبەستت لە ئێمە چییە؟ بەمن چی ئەتۆ بوویی بە مشك.

برۆنۆ ئەتۆش مشکی.

ئەو وتی، بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا، من مشك نیم.

وتم، برۆنۆ، دەترسم مشك بی.

ئەو هاواری کرد، گومانی تێدا نییە، من مشك نیم! بۆچی سووکایەتیم پێدەکەی؟ خۆ من هیچم لەتۆ نەکردووە! بۆچی بە مشك بانگم دەکەی؟

وتم، نازانی چ بەڵایەکت بەسەر هاتووە؟

برۆنۆ وتی، نازانم مەبەستت لەو قسانە چییە؟

وتم، دەبێ پێت راگەیەنم چەند کاتژمێر لەمەوپێش جادووگەران کردیانی بە مشك. دواتریش منیان کردە مشك.

هاواری کرد، درۆ دەکەی!

وتم، ئەگەر ئەوەندە هۆشت لەسەر خواردنی ئەو لەفەیە نەبایە، ئاگاداری پەنجە بچووکەکانت دەبووی. سەیری پەنجەکانت بکە.

برۆنۆ سەیری پەنجەکانی کردو هاواری کرد، ئەی هاوار بۆ خۆم! بوومە مشك! ئەگەر باوکم بزانێت!

وتم، لە وانەیە وا بیر بکاتەوە کە ئەوەش جۆرێکە لە پێشکەوتن.

برۆنۆ هەر هەڵبەزو دابەزی کرد و هاواری کرد، من نامەوێ مشك بم!

مشك



بوونەکەم قبوول ناکەم! من برۆنۆ جێنکینزم!

وتم، لە مشك بوونەکەمان ناخۆشتر ئەوەیە، ناچارین لە ناو کونە مشکدا بژین.

برۆنۆ هاواری کرد، نامەوێ لە ناو کونەمشکدا بژیم!

وتم، دەتوانی بچی بۆ ناو کەونتەر، کشمیش و پسکیت و چکولیات و شتی تر



بکرتێنی. دەتوانی تەواوی شەو لەوێ بمێنیەوە و تا دەتوانی بخۆی. کاری مشکەکان هەر ئەوەیە!

برۆنۆ بە بیستنی ئەو قسەیە ئاهێکی هاتەوە بەر و وتی، بیرۆکەیەکی خراپیش نییە! بەڵام خۆ من ناتوانم دەرگای سەلاجە بکەمەوە و خۆم بگەیەنمە مریشکی کوڵاو و ئەو خواردنانەی ماون؟ شەوانە لە ناومالّدا ئەوە کاری منە.

وتم، لەوانەیە باوکە دەوڵەمەندەکەت بتوانێ سەلاجەیەکی بچووکی تایبەت بە مشکت بۆ بکڕێ. سەلاجەیەك تۆ بتوانی دەرگاکەی بکەیەوە.

برۆنۆ وتی، وتت جادووگەرێك ئەو بەڵایەی بەسەر من هێناوە؟ کام جادووگەرە؟

وتم، لە یادم نییە؟ ئەوەی دوێنێ لە ناو هۆڵەکە بەستەیەکی چکولیات داپێت.

برۆنۆ هاواری کرد، گۆلکی پیری بۆگەن! دەردی دەرمان دەکەم! ئەو کێیە؟ لەکوێیە؟

وتم، لەبیری کە. ناتوانی هیچ بکەی. ئێستاکە گرنگترین مەسەلە، دایك و باوکتن. ئەوان بە چ شێوەیەك لەگەڵ ئەو مەسەلەیە رووبەروو دەبنەوە؟ ئایا بە میهرەبانی و دڵسۆزی لەگەڵت دەجوڵێنەوە؟

برۆنۆ کەمێك بیری لەو قسەیە کردەوە و وتی، پێموایە باوکم تارادەیەك سەرسام دەبێ.

دایکت چی؟

برۆنۆ وتی، ئەو لە مشك دەترسێ.

ئەگەر وایە کێشەیەکی گەورەت لە پێشە، راستە؟

ئەو وتی، بۆچی هەر سەبارەت بە من قسە دەکەی، ئەدی بۆخۆت چی؟

وتم، نەنکم بە تەواوی تێدەگات لەو مەسەلەیە، ئەو جادووگەران زۆر بە باشی دەناسێ.

برۆنۆ کەمێکی تری لە لەفەکەی خوارد و وتی، ئێستا دەڵێ چی بکەم؟

وتم، وابزانم باشترە یەکەم جار بچین بۆ لای نەنکم و راوێژی لەگەڵدا بکەین.
ئەو بۆ خۆی دەزانێ دەبێ چی بکەین؟

بۆ لای دەرگای ڕاڕەوەکە کە ئاوەڵا بوو، رۆیشتم. برۆنۆ لە کاتێکدا پارچە لەفەکەی توند بە پەنجەکانی گرتبوو، بە دوای من کەوت.

وتم، کاتێك گەیشتینە راڕەوەکە، دەبێ خێرا وەك تیر ڕابکەین. بە تەنیشت دیوارەکەدا برۆ و دوا بە دوای من وەرە. هیچ قسەیەکیش مەکە، نابێ رێگە بدەی کەس پێت بزانێ. لە یادی نەکەی ئەگەر کەسێك چاوی بە تۆ بکەوێ، مردنت مسۆگەرە.

لەفەکەم پڕ دایەو لە ناو پەنجەکانم دەرهێناو فڕێمدا و وتم، لێرەوە، لێم دوور مەکەوە.



# سڵاو نەنە گیان

هە ر لەگەڵ رۆیشتنە دەر لە هۆڵی مۆسیقایەکە ، تینمان تێکرد و بەخێرایی لە راڕەوەکە رۆیشتینە خوارێ. ژووری حەسانەوە و خوێندنەوە و کتێبخانە و وێنەکێشانمان رەت کرد و ڕام کرد بۆ لای قادرمەکان. بێ ئەوەی لە دیوارەکە دوور کەومەوە قادرمەکانم یەك بە یەك بە جێ هێشتن. لەبەر خۆمەوە وتم، برۆنۆ لە دوامەوەی؟

برۆنۆ وتی، بەڵێ، خەمت نەبێ.

ژووری من و نەنکم لە نهۆمی پێنجەم بوو. گەیشتن بۆ ئەوێ وەك سەرکەوتن لە چیا بوو. بەڵام ئێمە بە بێ ئەوەی کەس ببینین گەیشتینە نهۆمی پێنجەم، چونکە هەموویان بالآبەر بەکار دێنن. لە نهۆمی پێنجەم، رۆیشتم بۆ لای ژووری نەنکم. جووتێکی پێڵاو لە دەرێ دانابوو تا خاوێنیان کاتەوە. برۆنۆ لە تەنیشتم بوو. پرسی، ئێستا دەبێ چی بکەین؟

لەناکاو چاوم بە خزمەتکارێکی ژن کەوت کە لەو لای ڕاڕەوەکەوە دەهات بۆ لای ئێمە. یەکسەر ناسیمەوە. هەمان خزمەتکار بوو کە ڕاپۆرتی منی بە بەڕێوەبەری ئوتێلەکە دابوو، کە مشکم لەگەڵ خۆمدا هێناوە. هەرگیز نەدەبوو لەو جۆرە حاڵەتانەدا کەسێکی وا ببینێ. بە برۆنۆم وت، زووکە، لە ناو یەکێك لەو پێڵاوانەدا خۆت حەشاردە! هەردووکمان خۆمان لە پێڵاوەکان هاویشت و چاوەڕوان بووین تا ژنە خزمتکارەکە بە تەنیشتماندا تێپەڕێ. بەڵام کاتێك گەیشتە لای پێڵاوەکان، دوولا هاتەوە تا هەڵیانگرێت و دەستی لە ناو ئەو لینگە پێڵاوە ڕاکرد، کە من خۆم تێدا شاردبۆوە. کاتێك دەستی پێم کەوت، گازم لێ گرت.



کارێکی گێلانە بوو، بەڵام من ئەو کاردم وەکو غەریزەەیك ئەنجامدا، هیچ مەبەستێکم نەبوو. ئەو قیژەیەکی وەهای کرد پێموایە دەنگی تا گەرووی مانش رۆیشت، دوایی پێڵاوەکەی فرێداو وەك با لە راڕەوەکە سەراوژێر بۆوە. نەنکم دەرگاکەی کردەوە و وتی، چی رووێداوە لێرە؟ من بە بن لاقی نەنکمدا خۆم لە ژووریێ ڕاکرد و برۆنۆش بەدوای مندا هات.

هاوارم کرد، نەنەگیان، توخوا زووکە دەرگاکە داخە! ئەو سەیری دەوروبەری خۆی کرد و دوو مشکی قاوەیی لەسەر فەرشەکە بینی.

وتم، توخوا ئەو دەرگایە داخە! ئەو دیتی بەراستی ئەوە منم قسە دەکەم و دەنگی منی ناسیەوە. لە سەرسامیان لە شوێنی خۆی ویشك بوو. نەیدەتوانی بجولێت. لەپەڕ هەموو جەستەی، پەنجەکان و باسکی و سەری وەك هەیکەلێکی بەردی ویشك بۆوە. دەموچاوی وەك گێچ سپی هەڵگەڕا و چاوەکانی ئەوەندە گەورە ببوو کە سپیەنەکەی بە تەواوی دەبینرا. دواتر لەرزێکی وا کەوتە گیانی کە پێموابوو ئێستاکە دەکەوێت و لە هۆش خۆی دەچێ.

وتم، نەنەگیان، تکا دەکەم یەکسەر دەرگاکە داخە، لەوانەیە ئەو خزمەتکارە ترسناکە بێتە ژوورەوە.

هەر چونێك بێ هاتەوە خۆی و دەرگاکەی داخست. دوایی پاڵی وە دەرگاکە داو بەو رەنگە زەرد هەڵگەڕاوە و دەست و پێی لەرزۆکەیەوە تێمەوە ڕاما. فرمێسك لە چاوەکانی هاتە خوارێ و لەسەر گۆنەیدا چۆڕایەوە. وتم، مەگری نەنەگیان، گریانی تۆ کارەکان خراپتر دەکات. من خۆم لە دەستیان رزگار کرد و هێشتا زیندووم. برۆنۆش بە هەمان شێوە.

ئەو زۆر بە هێواشی دوولا هاتەوەو منی لەسەر زەوی هەڵگرت. دوایی بە دەستەکەی تری برۆنۆشی هەڵگرت و هەردووکمانی لەسەر مێزەکە دانا. زەرفێك

مۆز لەسەر مێزەکە بوو. برۆنۆ بێ راوەستان خۆی هەڵدایە ناو زەرفەکە و ددانی لە پێستی مۆزێك ڕاکرد تا بگاتە خودی مۆزەکە.

نەنکم بێ ئەوەی چاوم لەسەر هەڵگرێ، دستی لەسەر دەسکی کورسیەکەی دانا.

وتم، نەنەگیان، دانیشە.

ئەو لەسەر کورسیەکەی بلاو بۆوە.

لەبەر خۆیەوە وتی، خۆشەویستی دڵەکەم، و فرمێسك وەك رووبار بە چاویدا دەهاتە خوارێ. ئەی هاوار، کوڕە بچووکۆلە و ئازیز و داماوی من، ئەوان چ بەلایەکیان بەسەر هێناوی؟

نەنەگیان، دەزانم ئەوان چ بەلایەکیان بەسەر من هێناوە و دەشزانم کە چیم، بەلام سەیرەکە ئەوەیە کە هیچ هەستێکی ناخۆشم سەبارەت بەو حاڵەی خۆم نییە.



تەنانەت توڕەش نیم. لەڕاستیدا، پێشم خۆشە. دەزانم کە ئیتر کوڕێك نیم و هەرگیزیش نابم، بەڵام تا ئەو کاتەی تۆ وەك هەمیشە ئاگاداریم بکەی، حاڵم زۆر باش دەبێ.

نەنکم لەبەر خۆیەوە وتی، هەرگیز بە تەنیا جێت ناهێڵم، ئەوە یان کێیە؟

وتم، کوڕێك بە ناوی برۆنۆ جێنکینز، یەکەم جار ئەویان کردە مشك.

نەنکم جگەرەیەکی گەورە و رەشی لە جانتایەکەی دەر هێنا و لە ناو تەنورەکەی هاویشت. دوایی پاکەتە شقارتەیەکی هەڵگرت و دەنکێکی هەڵکرد، بەڵام دەستەکانی وەها دەلەرزی کە نەیدەتوانی جگەرەکەی داگیرسێنێ. هەرچۆنێك بێ دایگیرساند ومژێکی قووڵ و دوور و درێژی لێدا. لەوە دەچوو کەمێك ئارام بووبێتەوە.

لەبەر خۆیەوە وتی، ئەوە لە کوێ روویدا؟ جادووگەرەکە ئێستا لە کوێیە؟ هێشتاش هەر لە ئوتێلەکەیە؟

وتم، نەنەگیان، یەك جادووگەر نەبوو! ئەوان سەت کەس بوون! هەمووشیان لێرەن! هەر ئێستاکە هەموویان لە ناو ئوتێلەکەن.

ئەو هاتە پێش و تێمەوەڕاما، مەبەستت ئەوەیە کە.... واتە دەتەوێ بەڵێ..... مەبەستت ئەوەیە ئەوان دەیانەوێ کۆبوونەوەی ساڵانەیان لە ناو ئەو ئوتێلەدا بگرن؟

نەنەگیان کۆبوونەوەکەیان کرد و تەواو بوو! گوێم لە هەموو شتەکان بوو! هەموویان لەگەڵ جادووگەری مەزن لە نهۆمی خوارەوەن. ئەوان وانیشان دەدەن کە ئەندامی ئەنجومەنی پاشایەتی پێشگیری لە ستەم کردنن بەرامبەر بە منداڵان! ئێستاش لەگەڵ بەڕێوەبەری ئوتێلەکە چای دەخۆنەوە!



بۆخۆیان تۆیان گرت؟

وتم، بۆنەکەم ئاشکرای کردم.

ئەو ئاهێکی هەڵکێشا و وتی، بۆنی پیسایی و کشپل، ها؟

وابزانم. بەڵام زۆر بەهێز نەبوو. ئەوان زۆر درەنگ بۆنەکەمیان هەست پێکرد، چونکە دەمێکە خۆم نەشوشتووە.

نەنکم وتی، منداڵەکان هەرگیز نابێ خۆیان بشۆن. کارێکی زۆر مەترسیدارە.

منیش لەگەڵت هاوڕام نەنەگیان.

ئەو کەمێکی تر وەستا و مژێکی تری لە جگەرەکەی دا و دواتر وتی، بەڕاستی مەبەستت ئەوەیە ئێستا ئەوان لە نهۆمی خوارەوە خەریکی خواردنەوەی چان؟

بە تەواوی دڵنیام، نەنەگیان. ئەو کەمێکی تر وەستا. وردە وردە خۆشی و شادی هەمیشەیی لە چاوەکانی نەنکم دا ئاشکرا بوو، لەپڕ نیگایەکەی ساف و

ڕێك بوو و بە توندی پرسی، زووکە هەموو شتەکەم لە سەرتاوە تا کۆتایی بۆ بگێڕەوە. زووکە.

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و دەستم کرد بە قسە کردن. چۆنیەتی ڕۆیشتن بۆ هۆڵی سەما کردن و خۆ حەشاردان لە پشت پەردەکە بۆ فێرکردنی مشکەکان، هەموویم بۆ گێڕایەوە. جەریانی تابلۆی سەر دەرگاکەشم بۆ گێڕایەوە، کە لەسەری نووسرابوو، ئەنجومەنی پاشایەتی پێشگیری لە ستەم کردن بەرامبەر بە منداڵان. جەریانی هاتن و دانیشتنی ژنەکان و ژنە باڵا وردەکەی لەسەر سەکۆیەکە دەرکەوت و هەڵگرتنی نیقابەکەی، بۆم گێڕایەوە. بەڵام کاتێك دەمویست سەر وسەکوتە واقعیەکەی بۆ شیبکەمەوە، نەمتوانی وشەی پڕ بە پێستی خۆی بە کار بێنم. وتم، نەنەگیان، ترسناك بوو! وەك ئەوەی بوو... لەوە دەچوو دەموچاوی بۆگەنی کردبێ!...

نەنکم وتی، بەردەوام بە، قسەکەت مەبڕە.

دوایی جەریانی لابردنی پرچە دەسکردەکان و داکەندنی دەستکێشەکان و پێلاوەکان و دەرکەوتنی بەحرێك سەری کەچەڵ و بوونی پەنجەی دەستی ژنەکان و لاقە بێ پەنجەکانم بۆ گێڕایەوە.

نەنکم ئەوەندەی خۆ هێنابوو پێشەوە چی وای نەمابوو لەسەر کورسیەکەی بەربێتەوە خوارێ. دەستەکانیشی لەسەر گۆچانەکەی کە لە کاتی ڕۆیشتندا بەکاری دێنا توند کردبوو و بە چاوە کاڵەکانی کە وەك دوو ئەستێرە دەدرەوشانەوە، سەیری منی دەکرد.

دوایی جەریانی بەرز بوونەوەی پریشکە سپی و ڕووناکەکانی چاوی جادووگەری مەزن و ئاگر گرتنی جادووگەرەکەی ترم بۆ گێڕایەوە.

نەنکم بە سەرسامیەوە هاواری کرد، بیستبووم کە ئەو کارانە دەکەن، بەڵام بڕوام نەدەکرد! تا پێش تۆش هیچ کەس جگە لە جادووگەران ئەو شتانەیان بە چاوی خۆیان نەبینیوە! ئەوە بە ناوبانگترین سزادانی جادووگەری مەزنە! ئەو سزادانە، بە سوور کردنەوە بەناوبانگە. جادووگەران لە ترسی ئەو سزایە نوقەیان نایەت! بیستوومە جادووگەری مەزن لە کاتی کۆبوونەوەی ساڵانە، بە لانی کەم جادووگەریك سوور دەکاتەوە، تا ئەوانی تر چاوترسێن بکات.

مانای چییە نەنەگیان؟

هیچ ئازیزم، بەردەوام بە لە قسەکانت.

منیش جەریانی چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی فرمولی دروستکردنی مشکم بۆ گێڕایەوە و کاتێك گەیشتمە بەشی مشك کردنی هەموو منداڵانی بەریتانیا، ئەو یەکسەر لە شوێنی خۆی دەرپەڕی و هاواری کرد، دەمزانی! دەمزانی کە ئەوان خەریکن خۆیان بۆ کارێکی لەرادەبەدەر ترسناك ئامادە دەکەن!

وتم، دەبێ پێشیان بگرین.

ئەو گەڕایەوە و چاوی لەمنەوە بڕی و وتی، کەس ناتوانێ پێش بە جادووگەران بگرێ، دەبینی چاوەکانی جادووگەری مەزن بە تەنیایی چ هێزێکی ترسناکی هەیە! ئەو بە پریشکە سپی و رووناکەکانی دەتوانێ هەمووانمان لە ناو بەرێت! خۆ ئەتۆ بینیت!

بەڵام نەنەگیان، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئێمە نابێ رێگە بدەین ئەوان هەموو منداڵانی بەریتانیا بکەن بە مشك.

نەنکم وتی، هێشتا هەمووت نەگێڕاوەتەوە، جەریانی برۆنۆ چییە؟ ئەو بەڵایەیان چۆن بەسەر هێنا. هاتنی برۆنۆم بۆ گێڕایەوە و وتم، بە چاوی خۆم دیتم کە ئەو بچووك بۆوە و تا شێوەی وەکو شێوەی مشکی لێهات. نەنکم سەیرێکی

برۆنۆی کرد کە خەریکی خواردنی مۆز بوو، و لە منی پرسی، ئەو هیچ کات دەست لە خواردن ناکێشێتەوە؟

وتم، هیچ کات، نەنەگیان دەتوانی شتێکم بۆ شیبکەیەوە؟

وتی، هەوڵدەدەم. دەستی درێژ کرد و منی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و خستمیە سەر ئەژنۆی و زۆر بە ئارامی دەستی بە تووکە نەرمەکەی گەردەنمدا هێنا. ئەو کارە زۆر خۆش و بەتام بوو. لێی پرسیم، ئازیزم، دەتەوێ چی بپرسی؟

وتم، نازانم من و برۆنۆ چۆن دەتوانین وەکو جاران قسە بکەین.

نەنکم وتی، زۆر ئاسانە، ئەوان توانیویانە تەنیا بچووکت بکەنەوە و چوار پێ و چاکەتێکی تووکاویت بۆ دروست بکەن، بەڵام نەیانتوانیوە بتکەنە یەك هەزارۆمی مشکێکیش. تۆ هێشتاش هەر بۆ خۆتی، تەنیا شێوەت گۆڕاوە، تۆ هێشتاش ئەقل و هۆش و دەنگی خۆتت هەیە، دەبێ سوپاسی خوا بکەیین.

وتم، ئەگەر وایە من هەرگیز مشکێکی ئاسایی نیم، جۆرە مشکێکی مرۆڤم.

نەنکم وتی، راستە، تۆ مرۆڤێکی لە بەرگی مشکدا، بوونەوەرێکی دەگمەنی.

دوای چەند چرکەسات، نەنکم بە پەنجەی دەستێکی، دەستی پێدا دێنام و بە دەستەکەی دیکەی جگەرەی دەکێشا. هیچ دەنگێك نەدەهات جگە لە دەنگی هێرش بردنی برۆنۆ بۆ زەرفی مۆزەکان. بەڵام من تەنیا لەسەر ئەژنۆی نەنکم درێژ ببووم و بیرم دەکردەوە. مێشکم بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرکاری دەکرد.

وتم، نەنەگیان، بیرۆکەیەکم هەیە.

چ بیرۆکەیەك ئازیزم؟

جادووگەری مەزن وتی، ژمارەی ژوورەکەی ٤٥٤، راستە؟

نەنکم وتی، بەڵێ.

ژمارەی ژوورەکەی من ٥٥٤ ە. ژوورەکەی من لە نهۆمی پێنجەمە، کەوا بوو ژووری ژمارە ٤٥٤ دەبێ لە نهۆمی چوارەم بێ.

نەنکم وتی، راستە.

ئێوە پێتان وانییە لەوانەیە ژووری ژمارە ٤٥٤ رێك لە ژێر ژووری ژمارە ٥٥٤ بێت؟

نەنکم وتی، بە بێ ئەملاو ئەولا. ئەو ئوتێلە نوێیانە رێك وەك قوتووی شقارتە بەرز بوونەوە. گریمان وابوو، مەبەستت لەو قسەیە چییە.

وتم، دەتوانی بمبەی بۆ سەر بالکۆنەکە تا سەیرێکی خوارەوە بکەم؟ هەموو ژوورەکانی ئەو ئوتێلە بەشکۆیە هەیوانێکی بچووك و تایبەتیان هەبوو. نەنکم منی بۆ سەر بالکۆنی ژوورەکەی خۆم برد. هەردووکمان سەیری بالکۆنی نهۆمی خوار خۆمانمان کرد.

وتم، ئەگەر ئەوە ژووری ئەو بێت، بەدڵنیاییەوە دەتوانم برۆمە خوارەوە و ئەو شلەیە بدۆزمەوە.

نەنکم وتی، دووبارە لە گیریان بکەوی، من رێگەت پێنادەم.

وتم، ئێستا هەموو جادووگەران لەسەر هەیوانەکەن و لەگەڵ بەرێوەبەری ئوتێلەکە چای دەخۆنەوە. لەوانەیە جاووگەری مەزن تا کاتژمێر شەش یا چەند خولەکێك پێش شەش نەگەرێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. لەو کاتژمێرەدا دەگەرێتەوە بۆ ژوورەکەی تا بەشە شلەی ئەو جادووگەرە پیرانە بدات کە ناتوانن بۆ دۆزینەوەی هێلکەی غرغرو لە درەخت سەرکەون.

نەنکم وتی، گریمان توانیت بچیە ژوورەوە، دوایی چی دەکەی؟

دوایی دەبێ بگەرێم و شوێنی شلەی دروستکەری مشکەکە بدۆزمەوە و ئەگەر توانیم شوشەیەك هەڵبگرم و بگەرێمەوە ئێرە.

دەتوانی هەڵیبگری؟

وتم، وابزانم دەتوانم، شوشەیەکی زۆر بچووکە.

نەنکم وتی، من لەو مادەیە دەترسم، ئەگەر دۆزیتەوە، دەتەوێ چی لێبکەی؟

وتم، هەر شوشەی بۆ پێنسەت منداڵ دانراوە. واتە بۆ هەر جادووگەرەی بە لانی کەمەوە دوو ئەوەندەی ئەندازەی پێویست بۆ کەسێکە. دەتوانین هەمووانیان بکەینە مشك.

نەنکم مەترێك هەڵبەزیەوە. چی وای نەمابوو لەسەر مەحەجەرەکە بکەومە خوارێ. ئێمە لەسەر بالکۆنی ژوورەکەی من بووین و دووریەکەی تا شوێنی ئەوان نزیکەی هەزار مەتر بوو.

وتم، نەنەگیان، ئاگادار بە، خەریك بوو دەکەوتم.

نەنکم هاواری کرد، چ بیرۆکەیەکی باشە! زۆر باشە! بێ وێنەیە! کوڕەکەم تۆ بلیمەتی!

وتم، لە هیچ باشترە؟ بیرۆکەیەکی باشە، نا؟

نەنکم هاواری کرد، بە جوڵەیەك، بەسەر هەموو جادووگەرانی بەریتانیادا زاڵ دەبین! و بەربەرەکانی لەگەڵ جادووگەری مەزن دەکەین.

وتم، دەبێ هەوڵی خۆمان بدەین.

ئەو لە کاتێکدا لەبەر زۆری خۆشحاڵیەکەی وەخت بوو دووبارە لە باڵکۆنەکەوە بمخاتە خوارێ، وتی، گوێ بگرە، ئەگەر لەو کارەماندا سەرکەوین، ئەوە گەورەترین سەرکەوتنە لە تەواوی مێژووی جادووگەریدا.

وتم، دەبێ زۆر کاران ئەنجام بدەین.

نەنکم وتی، بەڵێ، زۆر. بەڵام گریمان یەکێك لەو شوشانەشت دەست کەوت، بە چ شێوەیەك لە خواردنەکەیانی دەکەی؟

وتم، دواتر بیری لێ دەکەمەوە، یەکەم جار دەبێ ئەو مادەیە بەدەست بێنم. چۆن دەتوانین دڵنیابین ژوورەکەی دروست لە ژێر ئەو ژوورەدیە؟

نەنکم وتی، ئێستا لێی دەکۆڵمەوە! بابڕۆیین! نابێ کات لەدەست بدەین! منی لەسەر دەستی دانا و بە پەلە لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەر و لە کاتێکدا لەگەڵ هەر هەنگاوەی، گۆچانەکەی لە ئەرزی دەکوتا، دەستی کرد بە ڕۆیشتن لە ڕاڕەوەکەدا.




خێرا لە قادرمەکان ڕۆیشتینە خوارێ و گەیشتینە نهۆمی چوارەم. ژمارەی ژوورەکانی ئەوبەر ئەوبەری ڕاڕەوەکە، بە ژمارەی زێڕی لەسەریان هەڵکەندرابوو.

نەنکم هاواری کرد، ئەوەتا! ژووری ٤٥٤ دەسگیرەی دەرگاکەی سوڕاند. دەرگاکە داخرابوو. سەیرێکی ڕاڕەوە چۆلەکەی کرد و وتی، تۆ ڕاست دەکەی! ئەو

ژووره رێك له ژێر ژوورەکەی تۆدایه! گەڕایەوە بۆ لای قادرمەکان و ژمارەی ژوورەکانی، له ژووری جادووگەری مەزنەوە تا دەگاتە قادرمەکان ژمارد. شەش ژوور بوو.

دوایی رۆیشتەوە بۆ نهۆمی پێنجەم و ئەو کارەی دووبارە کردەوە.

دواتر هاواری کرد، ئەو رێك له ژێر تۆیه! ژوورەکەی رێك له ژێر ژووری تۆدایه!

منی بردەوە ژوورەکەی خۆم و دووبارە چۆوە بۆ باڵکۆنەکە و وتی، ئەوە باڵکۆنی ئەوە. بەبە، دەرگای باڵکۆنەکەشی لەسەر پشتە! ئێستا دەتەوێ چۆن بڕۆیه خوارێ؟

وتم، نازانم. ژوورەکەی ئەو له پێش ئوتێل و روو به دەریا و کەنارەکە بوو. له ژێر باڵکۆن، هەزاران مەتر خوارتر، دیوارێکی لێبوو به مەحەجەرەی نووك تیژەوە. ئەگەر بەربووبامایەوە، کارم تەواو بوو.

نەنکم وتی، تێگەیشتم! هەر بەو شێوەیەی که منی له دەستی گرتبوو، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی و خەریکی گەڕان بوو له ناو چەکمەجەی مێزەکەی. تۆپێکی خوری شین دەرهێنا. سەری خوریەکە به قولابی چنین و به گۆریەکی نیوەچڵەوە بوو، که بەتەما بوو بۆ منی بچنێ.

ئەو وتی، ئەوە زۆر باشە، له ناو گۆریەکەت داوێم وبەرێت دەکەم بۆ لای باڵکۆنی ژووری جادووگەری مەزن. بەڵام دەبێ پەله بکەین! هەر چرکەیەك ئەگەری هەیه ئەو دێوەزمه ترسناکه بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی.

# مشك ـــــ دز

نەنكم زۆر بە پەلە منی گەڕاندەوە بۆ ژوورەكەی خۆم و بردمی بۆ باڵكۆنەكە و پرسی، ئامادەی؟ ئێستا لە ناو گۆریەكەت داوێم.

وتم، هیوادارم پێم جێبەجێ بكرێ. من تەنیا مشكێكی بچووكم.

ئەو وتی، پێت ئەنجام دەدرێت ئازیزم، سەركەوتوو بی. منی لە گۆریەكە هاویشت و لە بالكۆنەكەوە ناردمیە خوارێ. منیش خۆم لە گۆریەكەدا كۆكردەوە و هەناسەم راگرت. لە كونی گۆریەكە، بە تەواوی دەردوەم دەدی. ئەو منداڵانەی لە كەنارەكە گەمەیان دەكرد، لە دوورەوە بە قەدەر مێرولە بوون. بای دەهات، گۆریەكە بەو بایە دەستی كرد بە جۆلانە كردن. سەرم بەرز كردەوە و سەری نەنكمم بینی كە پاڵی بە مەحەجەرەی نهۆمی سەرەوە دابوو. ئەو هاواری كرد، چی وای نەماوە! ئێستا دەگەینێ! ئارام، ئارام گەیشتی!

هەستم بە تەکانێکی هێواش کرد برۆ ژوورەوە! خێراکە، زووکە! بچۆ بۆ ژووریٚ! لە گۆریەکە دەرپەڕیم ڕامکردە ژووری جادووگەری مەزن. ئەو بۆنە رزیو و ناخۆشەی کە لە ژووری سەما کردن هەستم پێکردبوو، لێرەش هەمان بۆن دەهات.

ئەو بۆنە، بۆگەنیوی جادووگەران بوو. ئەو بۆنە ئاودەستی گشتیی و پیاوانەی وێستگەی شەمەندەفەری شارەکەمانی وەبیر دێنامەوە.

ژوورەکە بە روالّەت پاك و خاوێن بوو. هیچ ئاسەوارێك کە نیشان بدات کەسێکی نائاسایی لەو ژوورەدا نیشتەجیٚ بووە، نەدەبینرا. واتە ئەو شوشانە دەبیٚ لە کویٚ بن؟ هیچ جادووگەرێك ئەوەندە گێل نییە کە شتێکی گوماناوی لەبەر چاوی خزمەتکارەکان بەرلڵا کات و بڕوات.

لەپڕ چاوم بە بۆقێك کەوت کە لەسەر بەتانیەکە هەلّبەز و دابەزی دەکرد و بە بینینی من لە ژێر قەرەوێلەکە بزر بوو. منیش هەلّبەزیمەوە. گوێم لە دەنگی نەنکم بوو کە لە سەرەوەرا دەیوت، زووکە! شوشەکە هەلّگرە و وەرە دەریٚ! منیش لە ژوورەوە خەرێکی گەڕان بووم. کارێکی ئاسان نەبوو. بۆ نموونە، نەمدەتوانی چەکمەجەی مێزەکان بکەمەوە. بەم شێوەیە هیچ سوودێکی نەبوو. لەسەر ئەرزەکە دانیشتم و بیرم کردەوە.

ئەگەر جادووگەری مەزن بییەوێ شتێك بشارێتەوە، لە كوێی دادەنێ؟ بەدڵنیاییەوە لە چەكمەجەی بەردەستانی دانانێ. نایخاتە ناو دۆلابیش. بە تەواوی دیار بوو. خۆم هەڵدایە سەر قەرەوێلەكە تا بە جوانی سەیری ژوورەكە بكەم. بەخۆمم وت، ئەها، لەوانەیە لە ژێر دۆشەكەكە بێ. بە ئارامی، خۆم بە لێواری قەرەوێلەكەوە نووساند، و خۆم خزاندە ژێر دۆشكەكە. هەرچونێك بێ قایم پاڵم پێوەنا بۆ پێشەوە تا توانیم رێگەی بۆ خۆم بكەمەوە، بەڵام هیچم نەدەدی.



دەستم بردە ژێر دوشەكەكە، لەپڕ شتێكی رەق لە ناو دۆشەكەكەی سەر سەرم شلپەی لێ هات. خۆم بردە پێشەوە و پەنجەكانم لێ خشاند. واتە ئەوە خۆیەتی؟ شوشەیەكی بچووك بوو. شێوەكەم لە ژێر سەرچەفەكەش دەناسیەوە. بە درێژایی دۆشەكەكە چەند شتی بەرز و خڕی ترم هەست پێكرد. بە دڵنیاییەوە جادووگەری مەزن بەرگی دۆشەكەكەی دڕاندووە و شوشەكانی خستۆتە ناوی و دووبارە دوریویەتەوە. بە پەلە بە ددانان دەستم كرد بە دڕاندنی بەرگی دۆشەكەكەی سەر

سەرم. ددانەکانی پێشەوەم بێ ئەندازە تیژ بوون و دروستکردنی کونێك کاتێکی زۆری نەدەویست. بە کونەکەدا رۆیشتمە سەرێ و بە گەردنم شوشەیەکم گرت. ئەوم لە ناو بەرگەکەدا پاڵ پێوەنا بۆ پێشەوە و دوایی لە کونەکە هاتمە دەرێ.

گەڕامەوە پشتەوە و شوشەکەم لەگەڵ خۆم راکێشا و خۆم گەیاندە لێواری دۆشەکەکە. شوشەکەم لەسەر قەرەوێلەکە غلۆر کردەوە. شوشەکە تەقەیەکی لێهات، بەڵام نەشکا. لە لێواری قەرەوێلەکە خۆم هەڵدایە خوارێ و بە باشی سەیری شوشەکەم کرد. هەمان شوشە بوو کە جادووگەری مەزن لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ هۆڵی مۆسیقا. کاغەزێکی لەسەر درابوو: فرموڵی ٨٦، چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی دروستکەری مشك، و لە ژێریشی نووسرابوو، ئەو شوشەیە پێنسەت خۆراکی دروستکردنی مشکی تێدایە. هورا! زۆرم کەیف بە خۆم هات.

سێ بۆق بە قیرە قیڕ لە ژێر قەرەوێلەکە هاتنە دەرێ. لەسەر زەوی هەڵتوتەکان و بە چاوە گەورە و رەشەکانیانەوە تێمەوەڕامان. منیش تێیانەوە ڕامام. تا ئەو کات هیچ شتێکم بە غەمگینی ئەو چاوە گەورەانە نەدیبوو. لەپڕ هەستم کرد ئەو سێ بۆقانە زەمانێك، پێش ئەوەی دەستی جادووگەری مەزنیان بگاتێ، سێ منداڵ بوون. منیش راوەستابووم و شوشەکەم توند لە دەستی گرتبوو چاوم لە بۆقەکانەوە بڕیبوو.



لێم پرسین، ئێوە کێن؟ لە هەمان کاتدا، دەنگی سوڕاندنی کلیل لە ناو قفلی دەرگاکە بڵند بوو، دەرگاکە کەوتە سەر پشت و جادووگەری مەزن هاتە ژوورەوە. بۆقەکان بە چەند بازی توند و خێرا خۆیان گەیاندەوە ژێر قەرەوێلەکە. منیش کە قایم خۆم بە شوشەکەمەوە نووساندبوو، وەك تیر دوا بە دوای ئەوان ڕامکردە لای دیوارەکە و خۆم گەیاندە پایەی قەرەوێڵەکە. لەسەر فەرشەکە دەنگی پێی دەهات. لە پشت پایەکەوە سەیرم کرد. بۆقەکان هەر سێکیان لە ناوەراستی قەرەوێڵەکە لەسەر زەوی دانیشتبوون. بۆقەکان ناتوانن وەك مشك ڕابکەن. تەنیا کارێك کە ئەو داماوانە دەتوانن بیکەن ئەوەیە بە جوڵەی توند بازان بدەن.

لەپڕ دەموچاوی جادووگەری مەزن کە خەریکی سەیر کردنی ژێر قەرەوێڵەکە بوو، لە پێش چاوم بەدەرکەوت. سەرم لە پشت پایەی قەرەوێڵەکە شاردەوە. گوێم لە دەنگی بوو، بۆقە بچکۆلەکانی من، لەوێن؟ تا شەوێ لە هەر شوێنێکن، لەوێ بمێننەوە، کاتی خەوتن لە پەنجەررەکەوە فڕێتان دەدەمە دەررەوە تا باڵندە دەریایەکان بتانخۆن.

لەپڕ دەنگی بڵند و ئاشکرای نەنکمم بیست لە دەرگا کراوەکەی باڵکۆنەکە، خێراکە ئازیزم! زووکە! وەرە دەرێ!



جادووگەری مەزن بە توندی و تورەییەوە وتی، ئەوە دەنگی کێیە؟ دووبارە خۆم بە پایەکەوە نووساند و دیتم جادووگەری مەزن چوو بۆ لای باڵکۆنەکە و لەبەر خۆیەوە دەیوت، ئەوە کێیە؟ کێ وێراویەتی بە بێ ئیزنی من بێتە سەر باڵکۆنەکەم؟

دەنگی بەرز بۆوە، ئەو تۆپە خوریە لێرە چی دەکات؟

دەنگی نەنکم هات، ئۆی، سڵاو. ببورە، تۆپە خوریەکەم لەدەستی بەربۆوە. بەڵام خۆشبەختانە هیچی لێ نەهاتووە. سەرەکەی ترم هەر بەدەستەوەیە. ئافەرینم وت بەو ئارامیەی نەنکم.

جادووگەری مەزن بە توڕەییەوە وتی، ئێستا لەگەڵ کێت قسە دەکرد؟ بە کێت دەوت خێراکات و زووتر بێتە. دەررررەوە؟

گوێم لە دەنگی نەنکم بوو، خەریکی قسە کردن بووم لەگەڵ نەوە بچکۆلەکەم. دە کاتژمێرە چۆتە حەمامیّ، ئیتر دەبیّ بێتە دەرەوە. لەویّ دادەنیشیّ و کتێبی دەخوێنێتەوە و لەبیری دەچێتەوە لە کوێیە؟ ئازیزم، تۆ منداڵت نییە؟

جادووگەری مەزن هاواری کرد، نەخێررررر! و بە خێرایی گەڕایەوە بۆ ژووریّ و دەرگای باڵکۆنەکەی قایم پێکدادا.

بیّ چارە ببووم، ڕێگەی دەرباز بوونم داخرابوو. لە ژوورەوە لەگەڵ جادووگەری مەزن و سیّ بۆقی ترسناك حبس کرابووم. منیش بە ئەندازەی بۆقەکان ترسابووم. گومانی تێدا نییە ئەگەر جادووگەری مەزن چاوی بە من بکەوتایە، منیشی لە باڵکۆنەکەوە فڕێدەدا بۆ باڵندە دەریایەکان.

دەنگی دەرگای ژوورەکە هات. جادووگەری مەزن هاواری کرد، ئەوەیان کێیە؟

دەنگێکی ئارام و بیّ ڕۆح لە پشت دەرگاکەوە وتی، ئێمەین، جادووگەرە دێرینەکان. کاتژمێر شەشە، گەورەم! هاتووین ئەو شوشانەی بەڵێنت پێدابووین، وەریان بگرین.

دەنگی هەنگاوەکانی لەسەر فەرشەکە بڵند بۆوە.

دەرگاکە کرایەوە و یەك دنیا پێڵاو و لاق هاتنە ناوەندی ژوورەکە. ئەوان بەرادەیەك ئارام و بە دوو دڵییەوە هەنگاویان دەنا، وەك ئەوەی خاوەنی ئەو پێڵاوانە ترسی هەیە لە هاتنە ژوورەوە. جادووگەری مەزن بە توندی و توڕەییەوە وتی، وەرنە ژووریّ! وەرنە ژووریّ! بۆچی لە ڕاڕەوەکەدا دەستاودەستیّ دەکەن؟ کاتم زۆر نییە!

کاتێکی باش بوو. له پشت پایەی قەرەوێڵەکەوه دەرپەڕیم و وەك با ڕامکرده لای دەرگاکه، له ڕێیەدا لەسەر چەند جووت پێڵاو بازمدا و له کاتێکدا هێشتا شوشه به نرخەکەم به سینگی خۆمەوه نووساندبوو، له ماوەی سێ خولەکدا گەیشتم ڕاڕەوەکه.



هیچ هاواری مشك! مشك! نەدەهات. تەنیا دەنگێکی دەبیسترا، دەنگی قود قودی جادووگەرە گێل و دێرینەکان بوو. گەورەم ئێوە چەند میهرەبانن. و لەو جۆرە قسانە.

خێرا لە راڕەوەکە سەراوژێر بوومەوە خۆم گەیاندە قادرمەکان، چووم بۆ نهۆمی پێنجەم و دووبارە بە راڕەوەکەدا رۆیشتم تا گەیشتمە ژوورەکەی خۆم. سپاس بۆ خوا، هیچ کەس لە راڕەوەکە نەبوو. بە بنی شوشەکە بە تەپە تەپ لە دەرگامدا. تەپ، تەپ، تەپ، تەپ، تەپ، بۆچی نەنکم گوێی لە دەنگی دەرگاکە نییە؟ هەر جارەی شوشەکە بە دەرگاکە دەکەوت دەنگی تەپێکی هێواش بەرز دەبۆوە. تەپ، تەپ، تەپ. هێشتاش کەس لە راڕەوەکەدا نەدەبینرا.بەڵام دەرگاکە نەکرایەوە. خۆم بە غیرەت کرد و بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد، نەنەگیان! نەنەگیان! منم! دەرگاکە بکەوە!

لە ژوورەوە دەنگی پێ هات و دەرگاکە کرایەوە. وەك تیر خۆم لە ژووری ڕاکرد. هەڵبەز و دابەزم دەکرد و هاوارم دەکرد، نەنەگیان دۆزیمەوە! سەیری بکە، ئەوتا! شوشەیەکی پڕم دۆزیوەتەوە!

ئەو دەرگاکەی داخست، دوولا هاتەوە و بەرزی کردمەوە و لە باوەشی گرتم و هاواری کرد، ئاخ نەوەی ئازیزم! سپاس بۆ خوا ساغ و سەلامەتی! دوایی شوشەکەی لێ وەرگرتم و نووسراوەکەی سەری بە دەنگێکی بەرز خوێندەوە، فرموڵی چالاکی هەنگاو بە هەنگاوی درووسکەری مشك ژمارە ٨٦. ئەو شوشەیە پێنسەت خۆراکی دروسکەری مشکی تێدایە.

تۆ بلیمەتی کوڕی ئازیزم! کارەکەت نایاب بوو! تۆ لەرادەبەدەری! چۆن توانیت لە ژووری بیهێنیە دەر؟

وتم، کاتێك جادووگەرە دێرینەکان هاتنە ژووری، خێرا خۆم هەڵدایە دەرێ. نەنەگیان زۆر ترسام. پێمخۆش نییە جارێکی تر بڕۆمەوە بۆ ئەوێ.

نەنکم وتی، منیش دیتم!

تێگەیشتم. گوێم لە دەنگتان بوو. بینیت چەندە چەپەڵ و ترسناکە؟

نەنکم وتی، ئەو مرۆڤ کوژە. ئەو لە هەموو ژنی دنیایە زیاتر سیفاتی شەیتانی هەیە!

وتم، نیقابەکەت بینی؟

نەنکم وتی، مرۆڤ هەرگیز بڕوا ناکات، رێك لە دەموچاووی واقعی دەچێ. هەرچەند دەمزانی نیقابی لێداوە. بەڵام هیچ پێوەی دیار نەبوو. ئەو منی بە خۆیەوە گوشی و وتی، ئاخ ئازیزم! پێموابوو ئیتر ناتبینمەوە! زۆر خۆشحاڵم توانیت خۆت دەرباز بکەی!

# بەڕێز جێنکینز و خانمەکەی لەگەڵ برۆنۆ ڕووبەڕوو دەبنەوە:

نەنکم منی بردە ژوورەکەی خۆی و لەسەر مێزەکەی دانام. شوشە بە نرخەکەشی لە تەنیشتم دانا و پرسی، جادووگەران چ کاتژمێرێك نانی شەوێ دەخۆن؟

وتم، کاتژمێر هەشت.

ئەو سەیری کاتژمێرەکەی کرد و وتی، ئێستا کاتژمێر شەش و دە خولەکە. دەبێ بۆ هەنگاوێکی تر تا کاتژمێر هەشت سەبرکەین. لەپڕ چاوی بە برۆنۆ کەوت. ئەو هێشتاش لەسەر مێزەکە لە ناو زەرفی مۆزەکاندا بوو. سێ مۆزی تەواو کردبوو و ئامادەی هێرش کردن بوو بۆ سەر مۆزی چوارەم. وەك تۆپ فش ببوو.



نەنكم برۆنۆی لە ناو زەرفە مۆزەكە دەرهێنا و لەسەر مێزەكەی دانا و وتی، كات و ماوەی تەواومان هەیە. ئیتر كاتی وەی هاتووە ئەو بچكۆلەیە بگەڕێنینەوە بۆ ماڵێ. رازی برۆنۆ؟

برۆنۆ مۆڕەیەكی لێ كرد. تا ئەو كات نەمبینیبوو مشك مۆڕان بكات. ئەو وتی، ئەگەر دایك و باوكم بانایە، رێگەیان پێدەدام هەر چەندێكی پێمخۆشە و دەتوانم بخۆم. پێم باشە لە لای ئەوا ن بم.

نەنكم وتی، بەدڵنیاییەوە. دەزانی ئێستا دایكت وباوكت لە كوێن؟

وتم، تا یەك دوو كاتژمێر لەمەوپێش لە ژووری حەسانەوە بوون. ئەو كاتەی دەمانویست بێین بۆ لات، لە وێ بینیمن، دانیشتبوون.

نەنكم وتی، زۆر باشە، هەستە برۆیین و بزانین ئێستاش هەر لەوێن. دوایی سەیرێكی منی كرد و وتی، پێتخۆشە تۆش بێی؟

وتم، ئەگەر كێشە نییە.

من هەردووكتان لە جانتاكەم داوێم، نابێ دەنگو لێ بێ. نابێ بێڵن كەس بتانبینێ. ئەگەر ویستتان بێنە دەر، هەر لوتتان بێننە دەرێ.

جانتاکەی، جانتایەکی چەرمی رەش و گەورە بوو کە شێوەی دەسکەکەیّ لە پشتی کیسەڵ دەچوو. ئەو من و برۆنۆی هەڵگرت، و لە ناو جانتاکەی هاویشتین و وتی، دەسکی جانتاکە داناخەم. بەڵام ئاگاداربن کەس نەتانبینیّ.

هیچ پێمخۆش نەبوو خۆم لە چاوان دووربخەم. دەمەویست هەموو شتێك ببینم. جێی خۆم لە ناو گیرفانی جانتاکە لە تەنیشت دەسکەکە کردەوە، لە وێوە دەمتوانی هەر کات پێمخۆش بوو سەرم بێنمە دەر. برۆنۆ هاواری کرد، هۆی، مۆزەکەی ترم بدەیە با بیخۆم.

نەنکم وتی، زۆر باشە، ئەوەش بۆ ئەوەی دەنگت دەرنەیەت.

مۆزە نیوە خوراوەکەی لە ناو جانتاکە هاویشت، دوایی دەسکی جانتاکەی لەسەر شانی دانا و رۆیشتە دەر لە ژووریّ و بە گۆچانەکەی بە تەپە تەپ دەستی کرد بە رۆیشتن لە ڕاڕەوەکەدا. بە بالأبەر رۆیشتین بۆ نهۆمی یەکەم، و لە ڕێگەی ژووری خوێندنەوەوە رۆیشتین بۆ ژووری حەسانەوە. بەرێز جێنکینز و خانمەکەی بە خەیاڵێکی ئاسودە، لە ویّ لە سەر دوو کورسی دەستەدار دانیشتبوون و مێزێکی کورت و بچووکی شوشەیی لە پێشیان بوو. چەند گروپی تریشی لیّ بوون، بەڵام بەرێز جێنکینز و خانمەکەی تاکە ژن و مێردێك بوون کە کەسی تریان لە لا دانەنیشتبوو. بەرێز جێنکینز خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامە بوو خانمی جێنکینزیش خەریکی چنینی شتێکی بە رەنگی خەردەل بوو. من تەنیا لوت و چاوم لە جانتای نەنکم هێنابوو دەرەوە، بەڵام شوێنێکی زۆر باشم هەبوو دەمتوانی هەموو شتێك ببینم.

نەنکم جلێکی رەشی لەبەر بوو، بە گۆچانەوە تا ناوەندی ژووری حەسانەوە رۆیشت، لە پێش مێزی بەرێز جێنکینز و خانمەکەی وەستا و پرسی، ئێوە بەرێز جێنکینز و خانمی جێنکینزن؟

بەڕێز جێنکینز لە سەرەوەی ڕۆژنامەکە سەیرێکی کرد و برۆیەکانی تێگنا و وتی، بەڵێ، من جێنکینزم، چ کارێکتان دەتوانم بۆ ئەنجام بدەم؟

نەنکم وتی، بەداخەوە هەواڵێکی تارادەیەك ناخۆشم پێیە بۆتان، پەیوەندی بە کوڕەکەتان برۆنۆوە هەیە.

بەڕێز جێنگینز وتی، بە برۆنۆ؟

خانمی جێنکینز لەگەڵ چنینی شتەکە، سەری بەرز کردەوە.

بەڕێز جێنگینز پرسی، ئەو خرابکارە بچووکە دیسان چی کردووە؟ بەدڵنیاییەوە چێشتخانەکەی تێکوەرداوە.



نەنكم وتی، كەمێك خراپتر لەوە، وابزانم باشترە بچین بۆ شوێنێكی چۆڵتر تا بتوانین بە ئاسودەیی قسە بكەین.

بەڕێز جێنكینز وتی، شوێنی چۆل؟ بۆچی بۆ شوێنێكی چۆل؟

نەنكم وتی، روونكردنەوەی كەمێك ناخۆشە، پێم باشە پێش ئەوەی زیاتر بۆتان روون بكەمەوە، بچینە ژووری ئێوە و لەوێ دابنیشین.

بەڕێز جێنكینز رۆژنامەكەی هێنایە خوارێ. خانمی جێنكینز چنینەكەی راگرت. بەڕێز جێنكینز وتی، خانم، من نامەوێ بچمەوە ژوورەكەم. من لێرە زۆر ئاسودەم، سپاستان دەكەم.

ئەو پیاوێكی بە هەیكەل و تورە بوو و پێی خۆش نەبوو كەس رێوشوێنی بۆ دانێ. دوایی وتی، فەرمون قسەكەتان بكەن و بە جێمان بێڵن، شێوەی وتنەكەی جۆرێك بوو، وەك ئەوەی لەگەڵ كەسێكدا قسە بكات كە لە دەرگای پشتەوەی ماڵەكەیان بزوی قاپانی پێدەفرۆشێ.

نەنكە داماوەكەی من كە هەوڵی دابوو بە جوانترین شێوە قسەی لەگەڵ بكات، كەمێكیان لێ سوور بۆوە و وتی، ئێرە پڕە لە خەڵك. ئەوە مەسەلەیەكی تاكە كەسی و هەستیارە. بەڕێز جێنكینز وتی، خانم، من لە هەر شوێنێك پێمخۆش بێ قسە دەكەم، زووكە پێمان بڵێ جەریان چییە؟ برۆنۆ پەنجەرەی شكاندووە یا بەردی بە شوشەی عەینەكەكەت داداوە، هەر ئێستاكە پارەكەی دەدەم، بەڵام ئامادە نیم لەسەر ئەو كورسیە هەستم.

سێ چوار كەسی تریش خەریكی سەیر كردنمان بوون.

بەڕێز جێنكینز وتی، ئێستا برۆنۆ لە كوێیە؟ پێی بڵێ بێتە ئێرە كارم پێیەتی.

نەنكم وتی، لێرە حازر و ئامادەیە، لە ناو جانتاكەمدایە. و بە نووكی گۆچانەكەی لە جانتا چەرمی و گەورە و هەڵامساوەكەیدا.

بەرێز جێنکینز هاواری کرد، مەبەستت لەو شتە بێ مانایانە چییە؟ خانمی جێنکینز بە شێوەیەکی یەگجار ویشك وتی، دەتەوێ خۆت شیرین بکەی؟

نەنکم وتی، هەرگیز مەسەلەی خۆ شیرین کردن لە گۆڕێ نییە، کوڕەکەتان لەبەر بێ بەختی خراپی بەسەر هاتووە.

بەرێز جێنکینز وتی، ئەو هەمیشە خراپی بەسەر دێ. خوا هەمیشە یا بە زۆر خواردن ئازاری دەدات یا بە با و برك و ئەستوور بوونی سکی. دەبێ دوای نان خواردنی شەو گوێت لە دەنگی بێ. بە ئەندازەی یەك ئۆرکسترای سازی فلزی دەنگە دەنگی لە خۆی دەردێنیێ! بەڵام دوای خواردنی کەچکێك ڕۆن گرچەك حاڵی زۆر باش دەبێ! ئێستا بۆخۆی لە کوێیە؟

نەنکم وتی، ئێستاکە پێم وتن، لە ناو جانتای دەستمدایە. بەڵام من پێموایە، واباشترە پێش ئەوەی بەو سەر و سەکوتەوە بیبینن، بچین بۆ شوێنێکی چۆڵ و تایبەت.

خانمی جێنکینز وتی، ئەو ژنە شێتە، لێی گەڕێ با بڕوات.

نەنکم وتی، لەڕاستیدا کوڕەکەتان لە ڕەگ و ریشەوە تووشی گۆڕان بووە.

بەرێز جێنکینز هاواری کرد، تووشی گۆڕان بووە! ئەی ژنی شێت، مەبەستت لە تووشی گۆڕان بووە، چییە؟

خانمی جێنکینز وتی، بڕۆ ون بە! پیرێژنی گێل و شێت!

نەنکم وتی، هەوڵدەدەم تا ئەو جێیەی دەکرێ بە ئارامی و میهرەبانی پێتان حاڵی بکەم کە بڕۆنۆ لە ناو جانتای دەستم دایە. نەوەکەم بۆ خۆی بینیویەتی کە چ بەڵایەکیان بەسەر هێناوە.

بەرێز جێنکینز لە کاتێکدا سمێڵە رەشەکانی لەگەڵ هەر وشەیەکدا سەر و خواریان دەکرد هاواری کرد، بیکە بۆ خاتری خوا بە شێوەیەك قسە بکە کە ئێمەش لێی تێبگەیین، بینیویەتی کە کێ چ بەڵایەکی بەسەر هێناوە؟

نەنکم وتی، بینیویەتی کە جادووگەران کردوویانە بە مشك. خانمی جێکینز بە مێردەکەی وت، ئازیزم بانگی بەڕێوەبەری ئوتێلەکە بکە تا ئەو ژنە شێتە لە ئوتێلەکە فڕێداتە دەرەوە.

نەنکم بە بیستنی ئەو قسەیە، سەبر و تاقەتی نەما. دەستی کردە ناو جانتایەکە و برۆنۆی هێنایە دەر و لەسەر مێزە شوشەکەی کوتا. خانمی جێنکینز سەیرێکی مشکە بچووك و خەپلەکەی کرد کە هێشتا هەر خەریکی خواردنی مۆز بوو و وەهای قیژاند کە تەواوی گڵۆپ و سورەیاکانی هۆڵی حەسانەوە زرینگانەوە. لە هەمان کاتیشدا لەسەر کورسیەکەی خۆی هەڵدا و نەڕاندی، مشك! مشك! ئەوەی لێرە لابەن! من لە مشك دەترسم!

نەنکم وتی، ئەوە برۆنۆیە.

بەرێز جێنکینز وتی، برۆ ون بە ئەی پیرێژنی بێ نرخ و بێ شەرم! دواتر رۆژنامەکەی شڵپ شڵپ لە برۆنۆ راکێشا، بەڵکو لەسەر مێزەکەی دەرپەڕێنێ. نەنکم ڕایکردە پێشەوە، پێش ئەوەی برۆنۆی لە ناو بەرن، پڕی دایە و لەسەر مێزەکەی هەڵگرت. خانمی جێنکینز هێشتاش لەسەر یەك دەنگ هەر دەیقیژاند و بەرێز جێنکینز لەسەر سەرمانەوە راوەستابوو هاواری دەکرد، ئەوەی لابە لێرە! چۆن رێگە بە خۆت دەدەی هاوسەرەکەم بەم شێوەیە بترسێنی! خێراکە ئەو مشکە پیسە لێرە لابە!

خانمی جێنکینز هاواری کرد، یارمەتیم بدەن! دەموچاوی وەك بەر سکی ماسی لێهاتبوو.

نەنکم وتی، هەر چۆنێکی پێتان خۆشە، هەوڵی خۆمم دا. و لە کاتێکدا برۆنۆشی پێبوو، گەڕایەوە و لە ژوورەکە هاتە دەر.

# پلان

دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ ژوورەکەمان، نەنکم من و برۆنۆی لە ناو جانتاکە دەر هێنا و لەسەر مێزەکەی دانا و بە برۆنۆی وت، پێم بڵێ بۆچی دەنگت دەرنەهات و بە باوکت نەوت کە برۆنۆی.

برۆنۆ وتی، لەبەر ئەوەی زارم پڕ بوو. دواییش یەکسەر خۆی هەڵدایە ناو زەرفە مۆزەکە و خواردنی دەست پێکردەوە.

نەنکم پێیوت، چەند منداڵێکی بەد رەوشتی.

وتم، منداڵ نا، مشك.

زۆر راستە ئازیزم. بەڵام من کاتی ئاخ و داخ خواردنم نییە بۆ حاڵی ئەو. دەبێ بزانین دەتوانین چی بکەین لەگەڵ جادووگەران. تا یەك کاتژمێر و نیوی تر جادووگەران بۆ خواردنی نانی شەوێ دەچنە ژووری نان خواردن، راستە؟

وتم، بەڵێ راستە.

ئەو وتی، و دەبێ بە هەریەکەیان یەك شلەی دروسکەری مشکیان بدەینێ. بەڵام چۆناو چۆن دەبێ ئەو کارە بکەین؟

وتم، نەنەگیان، پێدەچێ لە یادت کردبێ مشکەکان دەتوانن بۆ شوێنی وا بڕۆن کە مرۆڤەکان ناتوانن.

ئەو وتی، زۆر راستە، بەڵام تەنانەت مشکەکانیش ناتوانن بە شوشەوە لەسەر مێزەکە بسوڕێنەوە و شلەی مشك ساز بە خواردنی جادووگەران داکەن.

وتم، مەبەستی من ژووری نان خواردن نەبوو.

ئەو پرسی، ئەدی مەبەستت کوێ بوو؟

وتم، ناو چێشتخانەکە، لەو کاتەی دەیانەوێ خواردنەکەیان بۆ لە قاپان بکەن.

نەنکم تێمەوە ڕاما و بە شێوەیەکی دڵخۆشکەر وتی، ئازیزم، پێموایە مشك بوونەکەت هێزی مێشکتی دوو بەرابەر کردووە!

وتم، مشکێکی بچووك دەتوانێ بە هەنگاوە بچووکەکانی بە تەنیشت مەنجەڵ و تاوەکاندا بڕوات، ئەگەر بە باشی ئاگادار بێ، کەس نایبینێ .

نەنکم هاواری کرد، ئافەرین بۆ ئەو هۆشە! بە بێ ئەولاو ئەولا ئەو کارەت پێی جێبەجێ دەکرێ!

وتم، بەڵام کێشەیەك هەیە، لە کوێیوە بزانم کام خواردنە هی ئەوانە، نامەوێ بە هەڵە بیکەمە ناو قاپێکی تر. ئەگەر بە هەڵە هەموو میوانەکانی ئوتێلەکە بکەم بە مشك، کارەسات دروست دەبێ، بە تایبەتی سەبارەت بە تۆ.

دەبێ بڕۆی بۆ چێشتخانەکە و لە شوێنێکی باش خۆت حەشار بدەی و ... چاو و گوێت بە باشی بکەیەوە. دەبێ خۆت لە کونێکیدا بشاریەوە و بە وردی گوێ بگری و بزانی چێشتلێنەرەکان چی دەڵێن... دوایی ئەگەر بەختت هەبێ، ئەوە سەرەداوی مەسەلەکە دەدۆزیەوە. هەندێك جار بۆ ژمارەیەکی زۆر، بە جیا خواردن دروست دەکرێ.

وتم، راستە، دەبێ ئەو کارە بکەم. دەبێ چاوەڕوان بم و گوێ بگرم و دوعا بکەم بەختم هەبێ و سەرکەوتوو بم.

نەنکم وتی، بەڵام ئەو کارە زۆر مەترسیدارە، لە ناو چێشتخانە بە ڕوویەکی خۆش پێشوازی لە مشکان ناکەن. ئەگەر بتبینن، کارت تەواوە.

وتم، ناهێڵم بمبینن.

ئەو وتی، لە بیرت بێ ئەو شوشەشت پێیە، لەبەر ئەوە ناتوانی زۆر خێرا و توندو تۆڵ بی.

وتم، شوشەکەی لە ناو دەستەکانم داوێم و خێرا خێرا ڕادەکەم. بۆ لە یادت کردووە ئێستاکەش ئەو کارەم کرد؟ بەو هەموو ڕێیەدا لە ژووری جادووگەری مەزنەوە تاکو ئێرەم هێنا.



ئەو وتی، سەرەکەی چۆن دەکەیەوە؟ لەوانەیە بۆت سەخت بێ.

وتم، ئێستا تاقی دەکەمەوە، شوشەکەم بە خۆمەوە نووساند و پەنجەکانم بە دەوری سەری شوشەکەدا سوڕاند، تێگەیشتم بە ئاسانی دەتوانم سەرەکەی بکەمەوە.

نەنکم وتی، زۆر باشە، بەڕاستی مشکێکی زیرەکی. سەیری کاتژمێرەکەی کرد و وتی، من ڕێك کاتژمێر حەوت و نیو بۆ خواردنی نانی شەوێ دەچم بۆ ژووری نان خواردن و تۆش لە ناو جانتاکەم دەهاوێم. دواتر تۆ لەگەڵ ئەو شوشە بە نرخت لە ژێر مێزەکە بەرەڵلا دەکەم. کارەکانی تریش دەبێ بۆخۆت جێبەجێ بکەی. دەبێ بە بێ ئەوەی کەس بتبینێ لە ژووری نان خواردنەوە خۆت بگەیەنی ئەو دەرگایەی کە دەچێ بۆ چێشتخانەکە. لەوێ خزمەتکارەکان بەردەوام لە هاتووچۆدان. تۆش دەبێ لە

کاتێکی باشدا، خێرا برۆی بۆ پشت سەری یەکێك لەوان، بەڵام توخوا ئاگاداربە لەژێر دەست و پێدا پان نەبیەوە یا نەکەویە بن دەرگا.

وتم، هەوڵی خۆم دەدەم.

هەرچییەکیش روویدا، رێگە مەدە بتگرن.

ئیتر لەو قسانە مەکە نەنەگیان، دەنا دەترسم و ناتوانم هیچ بکەم.

ئەو وتی، تۆ منداڵێکی ئازا و نەترسی، زۆرم خۆش دەوی.

پرسیم، چ لە برۆنۆی بکەین؟

برۆنۆ سەری بەرز کردەوە و بە زاری پڕ لە مۆزەوە وتی، منیش لەگەڵت دێم. نامەوێ لە نان خواردن دوا بکەوم.

نەنکم کەمێك چوو لە بیرکردنەوەوە، دوایی وتی، ئەگەر بەڵێن بدەی لە ناو جانتاکەمدا بمێنیەوە و هیچ دەنگێکت لێ نەیەت، ئەوە لەگەڵ خۆمت دەبەم.

برۆنۆ پرسی، لەسەر مێزەکە خواردنم بۆ تێدەکەی؟

ئەو وتی، بەو مەرجەی ئاگاداری رەفتارەکەت بی، لە منی پرسی، ئازیزم، تۆ ناتەوێ شتێك بخۆی؟

وتم، نا، سپاس. لەبەر خۆشی و دڵەراوکێ هیچ ئیشتیام نییە. دەبێ بۆ ئەو کارەی لە پێشم دایە توند و تۆڵ بم.

نەنکم وتی، راست دەکەی، ئەوە کارێکی زۆر گەورەیە. گەورەترین کارێك کە بە ئەنجامی دەگەیەنی.

# لە چێشتخانە

نەنکم وتی، کاتی خۆیەتی! ئەو کاتە گەورە و بە نرخە گەیشت! کوڕەکەم ئامادەی؟

کاتژمێر رێك حەوت و نیو بوو. برۆنۆ کە لە ناو زەرفەکەدا، خەریك بوو مۆزی چوارەمی تەواو دەکرد، بە نەنکمی وت، خولەکێك سەبرکە با ئەو چەند پارچانەش تەواو بکەم.

نەنکم وتی، نا! دەبێ بڕۆیین! دوایی بڵندی کرد و توند لە ناو دەستی هاویشت. زۆر نیگەران و شەپرزە بوو، تا ئەو کاتە ئەوم بەو حاڵتە نەبینیبوو. بە من و برۆنۆی وت، ئێستا هەردووکتان دەخەمە ناو جانتاکەم، بەڵام دەسکەکەی داناخەم. یەکەم جار برۆنۆی لەوێ هاویشت. منیش شوشەکەم بە سینگمەوە نووساندبوو و چاوەڕوان بووم و ئەو وتی، ئێستا نۆبەی تۆیە. بڵندی کردم و سەری لوتی ماچ کردم و وتی، سەرکەوتوو بی ئازیزم. وەی، خەریك بوو لە یادی بکەم، بە دڵنیاییەوە ئاگاداری کە ئێستا یەك کلکت هەیە، مەگەر نا؟

وتم، یەك چیم هەیە؟

کلك، یەك کلکی درێژ و پێچدار.

وتم، بەڕاستی هیچ هۆشم لەو مەسەلەیە نەبوو. خۆزگە بە خۆم، کلکم هەیە! ئەوە دەیبینم. بەراستی دەتوانم بیجولێنم! تارادەیەکیش گەورەیە، نا؟

نەنکم وتی، بۆ وەبیر هێنانەوە وتم، چۆن لەوانەیە لە کاتی سەرکەوتن لەسەر کورسی و مێزی چێشتخانە بە کەڵکت بێ. دەتوانی بایدەی و بە دەوری شتەکاندا بیکەی بە قولاب وەك جۆلانە لە شوێنە بەرزەکان پێی بێیە خوارێ.

وتم، خۆزگە پێشتر ئەو شتانەم دەزانی و هەندێکم راهێنان دەکرد.

نەنکم وتی، ئیتر درەنگ بووە، دەبێ بڕۆین. ئەو منی خستە ناو جانتاکە و لە تەنیشت برۆنۆی دانام. یەکسەر لەسەر جێگەکەم لە ناو گیرفانی جانتاکە دانیشتم تا بتوانم سەرم بێنمە دەر و ببینم چ شتێك روودەدات.

نەنکم گۆچانەکەی هەڵگرت و رۆیشتە راڕەوەکە و چوو بۆلای بالآبەرەکە. پەنجەی لەسەر دوگمەکە دانا، بالآبەرەکە هاتە سەرێ و ئەویش چوو بۆ ناوی. لە ناو بالآبەرەکە جگە لە ئێمە کەسی تری تێدا نەبوو.

ئەو وتی، گوێ بگرن، لە ژووری نان خواردن ناتوانم زۆرتان قسە لەگەڵ بکەم. ئەگەر ئەو کارە بکەم خەڵکی پێیان وایە گێلم و قسە لەگەڵ خۆمدا دەکەم.

بالآبەرەکە گەیشتە نهۆمی یەکەم و بە تەکانێك راوەستا. نەنکم لە بالآبەرەکە هاتە دەر و لە هۆڵی ئوتێلەکە رەت بوو و چوو بۆ ژووری نان خوادرن. ئەوێ ژوورێکی گەورە بوو، نەخشی سەر سەقفەکەی لە زێر دروست کرابوو و چوار دەوری ژوورەکە ئاوێنەی گەورەی لێدرابوو. میوانە هەمیشەیەکانی ئوتێلەکە مێزی تایبەت و دیاریکراویان هەبوو و زۆربەیان لەسەر جێگەی خۆیان دانیشتبوون و خەریکی نان خوادرن بوون. پێشخزمەتەکان قاپ و دەوری بە دەست

بە پەلە بەولاو بەملادا دەریشتن. مێزی ئێمە، مێزێکی بچووك بوو، تارادەیەك لە ناوەراستی ژوورەکە بوو. نەنکم چوو بۆ لای مێزەکە و لە پشتیەوە دانیشت.

سەرم لە جانتاکە هێنایە دەر و دوو مێزی درێژم لە ناوەراستی ژوورەکە بینی کە هێشتا بەتاڵ بوو. لەسەر هەر دووکیان کارتێکی بچووك لە ناو پایەیەکی زێوی دابوو کە لەسەری نووسرابوو، بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی ج س ج س ك تەرخان کراوە.

نەنکم بێ ئەوەی هیچ بڵێت سەیرێکی مێزەکانی کرد. دەسرەی سفرەکەی کردەوە و لەسەر تەنورەکەی راخست. دەستی کردە ژێر دەسرەکەی و بە ئارامی منی دەرهێنا، دوایی لە پشت دەسرەکەوە بڵندی کردم لە دەمی خۆی نزیك کردمەوە و لەبەر خۆیەوە وتی، دەمەوێ لەسەر ئەرزی و لە ژێر مێزەکەت دابنێم. دەسرەکە دەگاتە سەر ئەرزی. لەبەر ئەوە هیچ کەس ناتبینێت. شوشەکەت پێیە؟

لەبەر خۆمەوە وەڵامم دایەوە، بەڵێ، من ئامادەم نەنەگیان.

لە هەمان کاتدا، پێشخزمەتێکی رەش پۆش هات و لە تەنیشت مێزەکە راوەستا.

لاقەکانیم لە ژێر دەسرە سفرەکەوە دیت هەرکە دەستی کرد بە قسەکردن، ناسیمەوە. ناوی ویلیام بوو. بە نەنکمی وت، شەو خۆش خانم، کورە بچووکەکەت لەگەڵ نییە؟

نەنکم وتی، کەمێك نەخۆشە، لە ژوورێ پاڵکەوتووە.

ویلیام وتی، بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر نیگەران بووم، ئەو شەو سوپی نۆکی سەوزمان هەیە و بۆ خواردنی سەرەکی دەتوانن کەباب فیلە یا کەبابی بەرخۆڵە هەڵبژێرن.

نەنکم وتی، تکایە بۆ من سوپی نۆکی سەوز و کەبابی بەرخۆڵە بێنن.

بەڵام بە پەلە نیم ویلیام. ئەمشەو دەمەوێ لەسەرە خۆ و بە هێواشی نانەکەم بخۆم. لەڕاستیدا دەمەوێ سەرەتا پەرداخێك ئاوی پەرتەقاڵ بخۆمەوە.

ویلیام وتی، بەسەر چاو خانمەکەم، و چوو بۆ لای مێزێکی تر.

نەنکم وای خۆ دەرخست کە شتێکی لێ کەوتووە، و کاتێك خۆی دوولا هێنایەوە تا هەڵیگرێتەوە، منی لە ژێر دەسڕەی سفرەکە پاڵ پێوەنا و وتی، بڕۆ ئازیزم! و دوایی خۆی قیت کردەوە.



ئەویتریش دەکەوتە سەر خۆم. شوشە بە دەست راوەستام. شوێنی دەرگای چێشتخانەکەم پێدەزانی. بۆ ئەوەی بگەمە وێ دەبوایە نیوەی هۆڵی گەورەی ژووری نان خواردنم رەت کردبایە. بە خۆمم وت لێرەوە، و وەك تیر لە ژێر مێزەکە

دەرپەڕیم و چووم بۆ لای دیوارەکە. بەتەما نەبووم بە ناوەراستی هۆڵەکەدا تێپەڕ بم. زۆر مەترسیدار بوو. پلانەکەم ئەوە بوو کە تەواوی ئەو رێگایەی تا دەگاتە چێشتخانەکە بە تەنیشت دیوارەکەدا بڕۆم. ڕامکرد. ئای، چەندەم ڕاکرد. بەرواڵەت کەس منی نەدەبینی، هەموویان سەرقاڵی خواردن بوون. بەڵام بۆ گەیشتن بە دەرگای چێشتخانەکە، دەبوایە بە دەوری دەرگای سەرەکی هۆڵەکەدا سوڕابامەوە. شوشە بەدەست خۆم بە دەرگاکەوە نووساند. یەکەم جار، تەنیا پێڵاو و کۆڵۆنی پێی ژنەکانم دەدی کە وەك شەپۆل لە دەرگاکە رەت دەبوون. بەڵام، کاتێك سەرم بەرز کردەوە، یەکسەر ناسیمنەوە. جادووگەران بۆ خواردنی نانی شەوێ دەهاتن!

ڕاوەستام تا هەموویان بە تەنیشتمدا تێپەڕین، دوایی ڕۆیشتم بۆ لای دەرگای چێشتخانەکە. پێشخزمەتێك دەرگای کردەوە تا بێتە ژوورێ. لە پشتیەوە خۆم هەڵدایە ژوورێ و لە پشت سەتڵێکی گەورەی زبڵ خۆم شاردەوە. چەند خولەکێك لەوێ مامەوە تا بزانم ئەوان دەڵێن چی. ئەی ئەی! هەر تەقە تەقی مەنجەڵ و تاوان دەهات.

چێشلێنەرەکانیش هەر هاوار هاواریان بوو! پێشخزمەتەکان بەردەوام دەر و ژووریان دەکرد و بە هاوارەوە خواردنەکانیان بە چێشتلێنەرەکان رادەگەیاند! چواردانە سوپ و دوو کەبابی بەرخ و دوو دانە ماسی بۆ مێزی ژمارە بیست و هەشت! سێ دانە شیرینی و دوو دانە دۆندرمەی فراولە بۆ ژمارە حەڤدە! ئەوێ پڕ بوو لەو جۆرە دەنگە دەنگانە. لەسەر سەری منەوە دەسکە سەتڵێکی زبڵ و خۆڵی لێ بوو. شوشە بەدەست، خۆم هەڵداو لە هەوادا سوڕامەوە و بە کلکم دەسکی سەتڵەکەم گرت.

لەپڕ بە سەراوبنی و هەڵپەسێراوی لە هەوادا مامەوە. شتێکی سەیر و لەرادەبەدەر بوو. ئەو حاڵەتەم پێخۆش بوو. بە خۆمم وت، سەیرکە، چەند خۆشە، بۆ ئەوانەی لە سیرکدا لەسەر تەناف دەڕۆن ئەو کاتەی لە هەوادا بە هەڵپەسێراوی دەمێننەوە.





تەنیا جیاوازیەکی هەیبوو ئەوە بوو کە سیرکبازەکان تەنیا دەتوانن بۆ پێشەوەو بۆ پشتەوە بڕۆن. تەنافی من (مەبەستم کلکمە) منی بۆ هەر لایەکی پێمخۆش با، دەیبردم. کێ دەزانێ، لە وانەیە منیش ڕۆژێك ببمە مشکێکی سیرکباز. لە هەمان کاتدا، پێشخزمەتێك قاپ بەدەست هاتە ناو چێشتخانەکە و وتی، پیرێژنی مێزی ژمارە چواردە دەڵێ ئەو گۆشتە زۆر ڕەقە! دەیەوێ خواردنەکەی بۆ بگۆڕن! یەکێك لە چێشتلێنەرەکان وتی، قاپەکەی بدە بەمن! خۆم هەڵدایە سەر ئەرز و بە دزی لە پشت سەتڵە زبڵەکەوە سەیرم دەکرد. چێشتلێنەرەکە گۆشتی ناو قاپەکەی تاشی و کەمێکی پێکدادا و دوایی وتی، منداڵینە کەمێك ئەو گۆشتەی مشت ومالّ بدەن! دوایی قاپەکەی بە کارمەندەکانی چێشتخانەکەدا گەڕاند. دەزانن ئەوان چیان کرد؟ هەموو چێشتلێنەر و بەردەستەکانیان هەر یەکە و مستێکیان لەسەر قاپی ژنە پیرەکە دا! چێشتلێنەرەکە قاپەکەی دایەوە بە پێشخزمەتەکە و وتی، ئێستا بزانە چەندی کەیف بە خواردنەکەی دێ!

کەمێکی تر پێشخزمەتێکی دیکە هاتە چێشتخانە و هاواری کرد، میوانەکانی ئەنجومەنی ج س ج س ك سوپیان دەوێ، منیش چوار چاوم هەبوو، چواری تریشم قەرز کرد و دانیشتم تا بزانم ئەوان چی دەکەن. کەمێکم خۆ ڕاکیشایە پێشەوە تا هەموو شتێك بە باشی ببینم. پیاوێك کە کڵاوێکی سپی درێژی لەسەر بوو و وەك نەریت سەرۆکی چێشتلێنەرەکان بوو، هاواری کرد، سوپی ئەو میوانانە لە قاپێکی گەورەی زێوی تایبەت بکەن!

دواتر، قاپێکی زێوی زەبەلاحیان لەسەر مێزێکی تەختە کە درێژایی چێشتخانەکە تا دیواری بەرامبەری پڕ کردبۆوە، دانا. بە خۆمم وت، سوپەکەی لەو قاپە زیوییەی دەکەن، کە وابوو منیش دەبێ ئەوی لە ناو ئەو شوشەیە دایە بیکەمە ناو ئەو قاپە.

لەسەر مێزەکە قەفەزێکی درێژی پڕ لە مەنجەڵ و تاوەم بینی. بە خۆمم وت، ئەگەر بتوانم خۆم بگەیەنمە ئەو قەفەزە، کارم تەواوە. بەمشێوەیە ڕێك دەکەوتمە سەر قاپە سوپەکە.

بەڵام یەکەم جار دەبوو خۆم گەیاندبایە لایەکەی تری چێشتخانە و دواتر لە قەفەزی ناوەڕاستەوە سەرکەوتبام. لەپڕ بیرۆکەیەکی باشم بە مێشکی داهات! دووبارە خۆم هەڵداو کلکم لە دەسکی سەتڵە زبڵەکە توند کرد. دوایی بە سەراوبنی خۆم هەڵدایە پێشەوە و بەمشێوەیە ڕۆیشتمە سەرێ. ئەو تەناف بازیەی پار لە مەراسیمی جەژنی کریسمەس لە سیرکدا بینیبووم وەبیرم هاتەوە، تەنافەکەم ئەوەندە بادا کە لەپڕ لە ناوەڕاستی ئەرزو ئاسماندا هەڵواسرا. منیش ئەو کاتەی گەیشتمە سەری سەرەوە، لە چرکەساتێکی لەباردا کلکم ئازاد دەکەم و لە ناو چێشتخانەدا بڵند دەبمەوە و ڕێك لەسەر قەفەزی ناوەراست دێمە خوارەوە!





بە خۆمم وت، هیچ کارێك نییە مشکەکان نەتوانن ئەنجامی بدەن! من هێشتا سەرەتای کارەکەم بوو.

تا ئەو کات هیچ کەس منی نەبینیبوو. ئەوان زۆر بە توندی خەریکی سەردانی کردنی مەنجەڵ وتاوەکانیان بوون.



لە قەفەزی ناوەڕاستەوە بەلوعەیەکی ئاوم لە گۆشەیەك کردە نیشانە لە چاو تروکانێکدا خۆم گەیاندە سەر قەفەزەکە، لە ژێر سەقفەکە و لە ناوەڕاستی مەنجەڵ و تاوەکان. مەحاڵ بوو کەسێك لەوێوە ببینێ. شوێنێکی لەرادەبەدەر بوو، ڕێگەی خۆم بۆ سەر قەفەزەکە کردەوە و ڕێك چوومە سەر ئەو قاپە گەورە و زیویەی، کە قەرار بوو سوپەکەی تێکەن. شوشەکەم لەسەر ئەرزی دانا. سەرەکەم کردەوە و خۆم گەیاندە سەر لێواری قەفەزەکە و بە خێرایی هەموو ئەو شتەی لە ناوی بوو لە قاپە زیویەکەم کرد. یەك خولەك دواتر، یەکێك لە چێشتلێنەرەکان بە مەنجەڵە زەبەلاحی سوپەکەوە کە هەڵمی لێ هەڵدستا، هاتە پێش و هەمووی کردە ناو قاپە زیویەکە. سەری قاپەکەی نایەوە و هاواری کرد، سوپی میوانەکانی ئەنجومەن ئامادەیە! دواتر پێشخزمەتێك هات و قاپە زیویەکەی برد.

کارەکە تەواو ببوو! ئەگەر بە زیندوویش نەگەڕامەوە بۆ لای نەنکم، جادووگەران شلەی مشك ساز دەخۆن! شوشە بەتاڵەکەم لە پشت یەکێك لە منجەڵەکان دانا و ڕۆیشتم بۆ لای قەفەزەکەی سەرەوە. جوڵە بە بێ شوشە زۆر ئاسانتر بوو. بە درێژایی ئەو ڕێگایە بە کلکمەوە خۆم بە دەسکی مەنجەڵەکان هەڵداوەسی.



لە ژێر پێمەوە چێشتلێنەرەکان و پێشخزمەتەکان سەریان قاڵ بوو بە کەتری و تاوە و ئەو مەنجەڵانەی کە هەڵمیان لێ هەڵدەستا و هەر قوڵتە قوڵتیان بوو. ه٨بە خۆمم وت، ئاخ کورە، ژیان ئەوەیە! بوون بە مشك و ئەنجامدانی ئەو جۆرە چالاکیانە چ چێژێکی هەیە! بە بێ وەستان هەر جۆلانەم دەکرد. بە شێوەیەکی لەرادەبەدەر لە دەسکی ئەو مەنجەڵە بۆ دەسکی مەنجەڵەکەی تر جۆلانەم دەکرد. ئەوەندەم ئەو کارە پێخۆش بوو بە تەواوی لە بیرم کردبوو کە لەبەر چاوانم و ئەگەر بە رێکەوت یەکێك سەری بڵند بکردایە، یەکسەر منی دەبینی. پێشهاتەکانی تر ئەوندە بە خێرایی روویاندا کە هیچ کاتێك نەبوو بۆ رزگار بوونم. دەنگی پیاوێکم بیست کە دەینەڕاند، مشك! سەیری ئەو مشکە پیسە بکەن! لە خوارەوە چاوم بە هەیکەلێکی سپی پۆش کەوت کە کلاوێکی سپی لەسەر بوو و بە بریقەی چەقۆیەکی چێشتخانە کە لە هەوادا دەسوڕایەوە، هەستم بە ئازارێك کرد لە نوکی کلکمدا و بە سەر سەردا بەربوومەوە کەفی چێشتخانەکە.

تەنانەت لە کاتی بەربوونەوەشدا، دەمزانی چی روویداوە. زانیم کلکم لێ بۆتەوە و خەریکی بەربوونەوەدم. هەموو کارمەندەکانی چێشتخانە بەدوام دەکەوتن و هاواریان دەکرد، مشك! مشك! زووکەن بیگرن! منیش کەتمە خوارەوە و خۆم هەڵدا و دەرپەڕیم. دەوروبەرم پڕ بوو لە جزمەی پلاستێکی گەورە و رەش کە ترپ ترپ دەنگیان دەهات و منیش بێ وچان بە تەنیشتیاندا رامدەکرد و دەهاتم و دەچووم و دەخولامەوە و بە شێوەی زیگزاگ دەرۆیشتم. ئەوان هاواریان دەکرد، بیگرن! بیکوژن! لە ژێر پێتان پلچ و پانی کەنەوە! وا دەهاتە پێش چاوم تەواوی دونیا بۆتە جزمە رەش کە دەیانەوێ پلچ و پانم بکەنەوە و منیش زیگزاگ دەرۆیشتم و جێم دەگۆڕی و پێچاوپێچ دەرۆیشتم و دەسوڕامەوە. لەو پەڕی داماویدا، زانیم ئەو کارانە بۆ ئەوەیە کە بتوانم لە شوێنێك خۆم بشارمەوە. ئەو

کات چوومە ناو دەلینگی پانتۆڵی یەکێك لە چێشتلێنەرەکان و خۆم بە گۆریەکەیەوە نووساند.

چیشتلێنەرەکە هاواری کرد، ئاخ ئاخ، چوو ناو پانتۆڵەکەم! دەست راگرن کورینە، ئێستا دەیگرم!

دەستی چێشتلێنەرەکە خەریکی گەڕان بوو لە ناو پانتۆڵەکەیدا، ئەگەر خێرا نەجوڵابام، ئیتر بەڕاستی کارم تەواو بوو. تەنیا ریگەیەکەم لە پێش بوو ئەویش ئەوە بوو بڕۆمە سەرتر.

پەنجەکانم لە موی لاقی پیاوەکە گیر کردن و رامکردە لای سەرەوە، بەم



شێوەیەی کە دەرۆیشتمە سەرەوە، لە ئەژنۆی سەرکەوتم و گەیشتمە رانی.

پیاوەکە نەڕاندی، ئەی هاوار! وردە وردە دەڕواتە سەرێ! هەر سەرتر دەڕوات! دەنگی پێکەنینی چێشتلێنەرەکان بەرز بۆوە، بەڵام بڕوا بکەن بۆ خۆم هیچ پێکەنینم نەدەهات. چونکە بۆ رزگار کردنی ژیانم دەجەنگام. دەستی پیاوەکە

تەپ تەپ بە دەوروبەرەم دەکەوت و وەها سەر و خواری دەکرد وەك ئەوەی لەسەر خشتی گرم راوەستابێ، منیش هەر سەرتر دەرۆیشتم و شوێنی خۆم دەگۆڕی.



هێندەی پێنەچوو گەیشتمە سەرەوەی پانتۆڵەکە و ئیتر جێی چوونە سەرەوە نەمابوو.

پیاوەکەش هەر دەینەڕاند، فریام کەون! فریام کەون! چۆتە ناو بیجامەکەم! هەر وا گازم لێدەگرێ! بیهێننە دەرەوە! یەکێك یارمەتیم بدات و لە کۆڵم بکاتەوە!

یەکێکی تر هاواری کرد، ڕەزاگرانی شێت، بۆخۆت بیهێنە دەرێ! پانتۆڵەکەت داکەنە تا بیگرین!



ئێستا لە جێی زنجیری پانتۆڵەکە بووم. ئەوێ گەرم و تاریک بوو. دەمزانی کە دەبێ دیسان سەرتر بڕۆم. پەڕیمە پێشەوە و سەرەوەی دەلینگەکەی تری پانتۆڵەکەیم دۆزیەوە. وەك تیر ڕۆیشتمە خوارەوە و گەیشتمە سەر لێواری پانتۆڵەکە و دووبارە هاتمەوە سەرە ئەرز. چێشتلێنەرە گێلەکە هەروا دەیقیژاند، چۆتە ناو پانتۆڵەکەم! بیهێننە دەرەوە! تووخوا پێش ئەوەی هەلاهەلام بکات، بیهێننە دەرەوە؟! بە.خێرایی سەیرێکی ئەوانەم کرد لە چێشتخانە لە دەوری کۆ

ببوونەوە و وەك شێتان پێدەکەنین، هیچ کامیان ئاگایان لێ نەبوو، مشکێکی بچووك و قاوەیی دەپەڕی و خۆی لە گونیە پەتاتەیەکی هاویشت.



چوومە ناوەڕاستی پەتاتە پیس و خۆڵاویەکان هەناسەم ڕاگرت.

وابزانم لە هەمان کاتدا چێشتلێنەرەکە پانتۆڵەکەی دانابوو، چونکە گوێم لێ بوو هەموویان دەیانوت ئەدی کوا مشك! خۆ هیچی لێ نییە، ئەی گێل و شێت!

پیاوەکە بە هاوارەوە وتی، لە ناو پانتۆڵەکەمدا بوو! سوێندیٚ دەخۆم لە ناو پانتۆڵەکەمدا بوو! ئێوە خۆ تا ئێستا مشك نەچۆتە ناو پانتۆڵەکەتان! خۆ ئێوە نازانن مرۆڤ چ حاڵێکی بە سەردا دیٚ؟

تێگەیشتن لەو راستییە، کە بوونەوەرێکی بچووك و هیچی وەك من دەتوانیٚ کۆمەڵێك مرۆڤی گەورە بەمشێوەیە بێزار بکات، هەستم بە خۆشی دەکرد.

لە ناو پەتاتەکان خۆم خزاندە دەرەوە و بە هێواشی سەرم لە لێوی گونیەکە هێنایە دەر. دووبارە چێشتخانەکە ببوو بە شوێنی جموجۆڵ و جارو جەنجاڵ و هاتوچۆی بە پەلە و خێرای پێشخزمەتەکان.

ئەو پێشخزمەتەی پێشتر بۆ گۆڕینی گۆشتە رەق و کاڵەکە هاتبوو، دیسان هاتەوە بۆ چێشتخانەکە و هاواری کرد، ئەهای کوڕینە، لەو پیرێژنەم پرسی، ئێستا لەو گۆشتە رازی یان نا؟

وتی، زۆر تورت و ئاودارە! وتی، بەڕاستی بەتامە!

دەبوو لە چێشتخانەکە بڕۆمە دەر و گەڕابامەوە بۆ لای نەنکم. تەنیا رێگەیەك هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. دەبوو بیٚ وەستان و خۆ خافلاندن بازم دابایە سەر ئەرز و لە پشت سەری یەکێك لە پێشخزمەتەکان لە دەرگاکە چووباما دەرەوە. بیٚ دەنگ و ئارام راوەستام و چاوەڕوانی دەرفەت بووم. کلکم زۆر بە ئازار بوو. کۆم کردەوە تا سەیرێکی بکەم. چەند سانتیمەترێکی لیٚ ببۆوە و خوێنی لیٚ دەچۆڕایەوە. لەویٚ یەکێك لە پێشخزمەتەکان چەند قاپی پڕی دۆندرمەی پەمەیی لە کۆڵی خۆی نابوو. دوو دانە لە قاپەکانی بە دەستەوە بوو و دووی تریشی لەسەر باسکی دانابوو. بۆ لای دەرگاکە رۆیشت. بە شانی پاڵی بە دەرگاکەوە نا. لە گونیەی پەتاتەکان هاتمە دەریٚ و خێرا لە چێشتخانە رەت بووم و خۆم گەیاندە هۆڵی نان خواردن و تا ژێر مێزەکەی نەنکم بیٚ وچان رامکرد.

بینینی دووبارەی لاقەکانی نەنکم بەو پێڵاوە ڕەش و مۆدیل بەسەر چووانەی و بەو دوگمە و قەیتانانەوە زۆر دڵخۆشکەر بوو. لە یەکێك لە لاقەکانی ڕۆیشتمە سەر و لەسەر تەنوورەکەی دانیشتم فسکە فسکەوە پێموت، سڵاو نەنەگیان! گەڕامەوە! کارەکەم تەواو کرد! شلەکەم کردە ناو سوپەکەیان!

دەستەکانی هاتە خوارێ و نازی کیشام و بە فسکە فسکەوە وتی، ئافەرین ئازیزم! کارەکەت لەرادەبەدەر بوو! ئێستا خەریکی خواردنی ئەو سوپەن! لەپڕ دەستی کشاندەوە و لەبەر خۆیەوە وتی، ئەوە خوێنت لێ دێ، ئازیزم چ بەڵایەکیان بەسەر هێناوی؟

لە ناو جانتاکەی دەسڕەیەکی دەرهێنا و هەر چونێك بێ، لە سەری کلکی بەستم و وتی، ئێستا باشتر دەبێ. هەوڵ بدە هەر بیری لێ نەکەیەوە. بەڕاستی توانیت هەموو ئەو شوشەیە بکەیە ناو سوپەکەیان؟



وتم، تا دوایین دڵۆپ. دەکرێ لە شوێنێکم دابنێ تا بتوانم سەیریان بکەم؟

ئەو وڵامی دایەوە، بەڵێ. جانتاکەم لەسەر کورسیە بەتاڵەکەی تۆیە، لە تەنیشتم. ئێستا دەتخەمەوە ناوی، دەتوانی سەرت بێنیە دەرەوە، بەو مەرجەی زۆر

ئاگادار بی نەتبینن. برۆنۆش لەوێیە. کارت پێ نەبێ. کوتە گۆشتێکی گەورەم داوەتێ تا ماوەیەك پێی دەخافڵێ.

دەستی نەنکم منی گرتە خۆی، و لەسەر تەنورەکەی بڵند بووم و گواسترامەوە بۆ ناو جانتایەکە.

وتم، سڵاو برۆنۆ، ئەو لە کاتێکدا بن جانتاکەی بە ددانی گرتبوو، وتی، لەو گۆشتەی، خۆزگە کەمێکیشیان رۆنەکەرە بەسەردا کردبایە.

سەرم لە جانتاکە هێنایە دەرەوە. زۆر بە ئاشکرایی و بە روونی دەمدی کە جادووگەران لە پشت مێزە درێژەکانیان لە ناوەراستی هۆڵەکە دانیشتبوون. سوپەکانیان تەواو کردبوو و پێشخزمەتەکان خەریکی کۆکردنەوەی قاپەکان بوون. نەنکم یەکێك لەو جگەرە رەش و هێلنج هێنەرەانەی داگیرساندبوو و دوکەڵەکەی لە هەموو شوێنێك بڵاو ببۆوە. لە دەوروبەری ئێمە میوانەکانی پشووی هاوینی ئەو ئوتێلە تارادەیەك گەورە بە جارِ و جەنجاڵەوە قاپە چێشتەکانیان بەتاڵ کردن. نیوەیان زیاتر پیر و پاتاڵ و گۆچان بەدەست بوون، بەڵام ژمارەیەکی تارادەیەك زۆریشیان خانەوادە بوون واتە ژن و مێرد لەگەڵ چەند منداڵێك. هەموویان مرۆڤی بە ئەدەب و رێکوپێك بوون. مرۆڤ ئەگەر بیەوێ لە ئوتێلێکی بە شکۆدا نیشتەجێ بێ، دەبێ بزانی چۆن هەڵسوکەوت دەکات.

بە فسکە فسکەوە بە نەنکمم وت، نەنەگیان، ئەوە جادووگەری مەزنە!

نەنکیشم بە فسکە فسکەوە وەڵامی دایەوە، دەزانم! ئەو رەق و لاوازەیە کە جلکی رەشی لەبەرە و لەسەرەوەی مێزی تەنیشتم دانیشتووە!

بە هێواشی وتم، ئەو دەتوانێ مرۆڤەکان لە ناو ببات. بە پریشکە سپی و نورانیەکەی هەر کەسێکی بیەوێ لەو کەسانەی کە لە ناو هۆڵەکە دانیشتوون، لە ناوی دەبات.

نەنکم بە فسکە فسکەوە وتی، ئاگاداربە! ئەوە پێشخزمەتەکە دێ!

سەرم کردە ناو جانتاکە و گوێم لە دەنگی ویلیام بوو، کەبابی بەرخەکە خانم، چ جۆرە سەوزەیەکت پێخۆشە؟ نۆکی سەوز یان گێزەر؟

نەنکم وتی، تکایە تەنیا گێزەر، پەتاتم بۆ دامەنێ.

دەنگی دانانی گێزەر هات لە ناو قاپەکە. چرکەیەك بێ دەنگی باڵی کێشا. دوایی دەنگی پچە پچی نەنکم بەرز بۆوە، زۆر باشە، ئەو رۆیشت.

دووبارە سەرم هێنایەوە دەر و بە هێواشی وتم، دڵنیای ئاگادار نابێ کە من بەو شێوەیە سەرم دەرهێناوە؟

ئەو وەڵامی دایەوە، نا پێموا نییە کەس ئەو سەرە بچووکەی تۆ ببینێ. کێشەکە لێرەدایە کە من دەبێ بێ ئەوەی لێوم بجوڵێ قسەت لەگەڵدا بکەم.

وتم، زۆر بە جوانی ئەو کارە دەکەی.

ئەو وتی، جادووگەرانم ژماردن، ئەوەندەی کە تۆ دەوت نین. تۆ پێتوابوو دووسەت دانەن، وا نییە؟

وتم، وا هاتە بەرچاوم.

نەنکم وتی، منیش هەڵە بووم، پێموابوو بەریتانیا زۆر لەوە زیاتر جادووگەری لێیە.

پرسیم، چەند کەسن؟

هشتاو چوار کەس.

وتم، هشتا و پێنج دانە بوون، بەڵام یەکێکیان بوو بە کەباب.

لە هەمان کاتدا چاوم بە بەرێز جێنکینز باوکی برۆنۆ کەوت کە یەکراست بۆ لای مێزەی ئێمە دەهات. لەبەر خۆمەوە وتم، ئاگاداربە. نەنەگیان! باوکی برۆنۆ خەریکە دێ بۆ لامان.

# بەرێز جێنکینز و کوڕەکەی

بەرێز جێنکینز لە کاتێکدا سیمایەکی ماناداری بە خۆیەوە گرتبوو، بە چەند هەنگاوی بڵند خۆی گەیاندە مێزەکەی ئێمە و بە شێوەیەکی توند و بێ ئەدەبانەوە لە نەنکمی پرسی، نەوەکەت لە کوێیە؟

نەنکم سیمایەکی ساردی بەخۆوە گرت و وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە.

بەرێز جێنکینز بەردەوام بوو، پێموایە ئەو و کوڕەکەم برۆنۆ لە شوێنێک خەریکی کەتنانن. برۆنۆ بۆ نان خواردنی شەوێش نەهاتۆتەوە، ئەو وا بە ئاسانی واز لە خواردن ناهێنێ!

نەنکم وتی، دەبێ دانی پێدا بنێم کە ئیشتیای زۆر باشی هەیە.

بەرێز جێنکینز وتی، هەست دەکەم تۆش دەستت لەو کارەدا هەیە. نازانم تۆ چ بوونەوەرێکی، بۆشم گرنگ نییە، بەڵام ئەورۆ دوانیوەڕۆ فێڵێکی زۆر زەق و بەرچاوتان لە من و ژنەکەم کرد. بۆ چی ئەو مشکەت لەسەر مێزی ئێمە دانا؟

کەوتمە گومانەوە نەکا ئەو سێ کەسەتان بەتەمای فێڵێك بن. ئێستا ئەگەر دەزانن برۆنۆ لە کوێیە، تکایە خێرا پێم بڵێ.

نەنکم وتی، هـ ِ فێڵێك لە گۆڕێ نەبوو. ئەو مشکەی هەوڵم دەدا بتدەمێ، کوڕەکەتان برۆنۆ بوو. دەمویست چاکەتان لەگەڵ بکەم. دەمویست بیگەڕێنمەوە ناو باوەشی خانەوادەکەی. بەڵام ئێوە ئامادە نەبوون قەبوولی بکەن.

بەڕێز جێنکینز هاواری کرد، خانم، مەبستت لەو خۆ شێت کردنە چییە؟ کوڕی من خۆ مشك نییە! و لە حالێکدا کە سمێڵەکانی لە توڕەییەوە سەر و خواریان دەکرد، وتی، زووکە پێم بڵێ کوڕەکەم لە کوێیە ئەی ژنی شێت! خێراکە!

خانەوادەی میزی تەنیشتمان دەستیان لە خواردن هەڵگرتبوو و سەیری بەڕێز جێنکینزیان دەکرد. نەنکم دانیشتبوو و بە ئارامی جگەرەی دەکێشا. بەڕێز جێنکینز من بە باشی لە حالی تۆ تێدەگەم. هەر باوکێکی بەریتانی تریش لە جێی تۆ با، هەر ئەو حاڵەی دەبوو. بەڵام لە نەرویج واتە شوێنی ژیانم، لەم جۆرە رووداوانە زۆر روودەدات، ئێمە ئەو شتانەمان وەك بەشێك لە ژیانی رۆژانەمان قەبووڵ کردووە.

بەڕێز جێنکینز هاواری کرد، بەدڵنیاییەوە تۆ شێتی! ئەگەر ئیستاکە پێم نەڵێی برۆنۆ لە کوێیە، پۆلیسی ئاگادار دەکەم!

نەنکم بە هەمان ئارامیەوە وتی، برۆنۆ بۆتە مشك.

بەڕێز جێنکینز هاواری کرد، چۆن دەکرێ ببێـتە مشك!

برۆنۆ سەری لە جانتاکەم هێنایە دەر و وتی، بەڵێ بابە من بوومەتە مشك.

بەڕێز جێنکینز یەك مەتر لە جێی خۆی هەڵبەزیەوە.

برۆنۆ بە پێکەنینێکی مشکانەوە وتی، سڵاو بابە.

زاری بەڕێز جێنکینز بەرادەیەك داچەقابوو کە من دەمتوانی ددانە زێڕەکانی پشتەوەی بی باشی ببینم. برۆنۆ بەردەوام بوو، نیگەران مەبە بابە. ئەوەندەش ناخۆش نییە. تەنیا دوعا بکە پشیلە نەتوانێ بمگرێ.

بەڕێز جێنکینز بە تەتە پەتە کەوت و وتی، ب...ب... برۆنۆ!



برۆنۆش بە زەردەخەنەیەکی مشکانەوە کە زاری تا بناگوێی کردبۆوە وتی، ئیتر چوون بۆ قوتابخانە نەما! بیرکاری و نووسینەوە نەما! لەمەودوا لە ناو قەفەزی چێشتخانەدا دەژیم و هەر خەریکی خواردنی کشمیش و هەنگوین دەبم!

بەڕێز جێنکینز دوبارە زمانی گیراوەوە وتی، ب...ب...برۆنۆ! ئەوە چۆن روویدا.

ئەو پیاوە داماوە تاقەتی قسە کردنی نەبوو.

نەنکم وتی، جادووگەران ئەو بەڵایەیان بەسەر هێناوە!

بەڕێز جێنکینز قیژاندی، مشك بە چ کەڵکێکم دێ!

نەنکم وتی، ئێستا یەکێکت هەیە دەبێ لەگەڵی میهرەبان بی.

بەڕێز جێنکینز نەڕاندی، ژنەکەم بە بیستنی ئەو هەواڵە شێت دەبێ! ئەو تاقەتی ئەو جۆرە شتانەی نییە!

نەنکم وتی، ناچار دەبێ خۆی لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا رابێنێ. هیوادارم لە ماڵەوە پشیلەتان نەبێ.

بەڕێز جێنکینز هاواری کرد، با! با! ژنەکەم پشیلەکەی تابسی لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێ!

نەنکم وتی، کە وابوو دەبێ پلانێك بۆ تابسی دابنێن. کوڕەکەتان زۆر لە پشیلە گرنترە.

برۆنۆ لە ناو جانتاکەوە هاواری کرد، دیارە گرنگترە! بە دایکم بڵێ پێش ئەوەی بێمەوە ماڵێ دەبێ تابسی لە ناو بەرێ!

نیوەی هۆڵی نانخواردن سەیری ئێمەیان دەکرد. کەوچك و چەقۆ و چەنگاڵەکان لەسەر مێزەکان کەوتبوون و هەموویان ئاوڕیان دابۆوە و لە بەڕێز جێنکینزەوە کە راوەستابوو و بە دەنگی بەرزە کە بۆخۆشی نەیدەزانی دەیەوێ چی بڵێ، رامابوون.

ئەوان نەیاندەتوانی من و برۆنۆ ببینن هەر بۆیە نەشیاندەزانی ئەو هات و هاوارە لەبەر چییە.

نەنکم بە زەردەخەنەیەکی گاڵتە جاڕانەوە وتی، بەڕاست دەتەوێ بزانی کێ ئەو بەڵایەی بەسەر هێناوە؟

دیار بوو دەیوست کێشە بۆ بەڕێز جێنکینز دروست بکات.

نەنکم وتی، ئەو ژنەی لەو لایەی دانیشتووە، ئەوەی کە جلکی رەشی لەبەرە و لە سەرەوەی ئەو مێزە درێژە دانیشتووە.

بەڕێز جێنکینز وتی، ئەوە سەرپەرشتی ج س ج س ك، یە!

نەنکم وتی، نەخێر، بەو شیوەیە نییە. ئەو جادووگەری مەزنی تەواوی جیهانە.

بەڕێز جێنکینز بە پەنجە ئیشارەتی بۆ کرد و بە دەنگی بەرزەوە وتی، مەبەستت ئەوەیە ئەو ژنە رەق و لاوازە ئەو بەڵایەی بەسەر کوڕەکەم هێناوە؟ سوێند بە خوا پارێزەرەکانم لە دژی ئەو وەخۆ دەخەم! تەرت و تونای دەکەم!

نەنکم پێیوت، بە پەلە بڕیار مەدە، لەوانەیە بتکاتە شتێکی وا سەیر کە سەت جار خراپتر لە مشك بێ. لەوانەیە بتکاتە قالۆچەی ناو حەمام.

بەریز جێنکینز سینگی هێنایە پێشەوە، ئەو قسانە چییە، بمکاتە قالۆچەی ناو حەمام! ناتوانێ هیچ کارێك بکات!

دوایی کەمێك گەڕا و رۆیشت بۆ لای مێزی جادووگەری مەزن. من و نەنکیشم سەیرمان دەکرد. برۆنۆش هاتبوو سەر مێزەکە و سەیری دەکرد. لەڕاستیدا هەمووان سەیری بەڕێز جێنکینزیان دەکرد. منیش لە هەمان شوێن مامەوە، تەنیا سەرم لەدەرەوە بوو. ناو جانتاکە ئەمین تر بوو.

# سەرکەوتن

بەرێز جێنکینز هێشتا چەند هەنگاوێکمان لی ̊دوور نەکەوتبۆوە کە دەنگی قیژەیەکی زۆر ناخۆش بلّند بۆوە و لە هەمان کاتدا جادووگەری مەزن لە شوێنی خۆی هەلّدرایە سەریّ!

دوایی بە هەمان شێوە کە دەیقیژاند لەسەر کورسیەکە راوەستا...

دواتر لە کاتێکدا دەستی رادەوەشاندن، چوو بۆ سەر مێزەکە...وتم، نەنەگیان چی بووە؟

نەنکم وتی، خولەکێك سەبر بگرە با بزانین.

لەپڕ حەفتا هەشتا دانە جادووگەر وەك ئەوەی دەرزیت تێڕاکردبن بە قیژە قیژەوە لە شوێنی خۆیان هەلّدرانە سەرەوە. چەند دانەیان لەسەر کورسیەکانیان راوەستابوون، چەندیشیان چوو بوونە سەر مێزەکان و بە شێوەیەکی تایبەتی و سەیر وە جولّە جولّ کەوتبوون و دەستەکانیان دەجولاّند. ئەو کات، لە چاوتروکانێکدا هات و هاوارەکەیان کپ بۆوە.

دواتر، هەموویان وەك جەنازە ویشك بوونەوە.

کەس دەنگی دەرنەدەهات.

وتم، نەنەگیان، خەریکە بچووك دەبنەوە، رێك وەك من کە بچووك بوومەوە، خەریکە بچووك دەبنەوە.

نەنکم وتی، بەڵێ.

وتم، کاریگەری دەرمانی دروستکەری مشکە! سەیرکەن! دەموچاوی چەند دانەیان موی لێهاتووە! بۆ چی ئەوەندە خێرا کاریگەر بوو نەنەگیان؟

نەنکم وتی، لەبەر ئەوەی ئەوانیش وەك تۆ زیاتر لە ئەندازەی دیاریکراو و پێویستیان خواردووە. وابزانم پێچ و مۆرەکانی کاتژمێرە زەنگدارەکەش لە بەرێك هەڵوەشان!



هەموو مشتەریەکانی هۆڵی نان خواردن لە شوێنی خۆیان هەستابوون و لە دەوری ئەو دوو مێزە درێژە کۆ ببوونەوە تا بە باشی بیبینن. نەنکم من و برۆنۆی بلند کرد تا لە هیچ شتێك دوا نەکەوین. ئەوەندە ئەو دیمەنەی پێخۆش بوو، بەردەوام دەچوو بۆسەر کورسیەکەی تا بتوانێ بە جوانی سەیری ئەو شتانە بکات کە روودەدات. لە ماوەی چەند چرکەساتدا هەموو جادووگەران بە تەواوی لە ناو چوون و ئەو دوو مێزە پڕ ببوو لە مشکی بچووك و قاوەیی، کە لە ناو یەکدا دەسوڕانەوە.



دەنگی قیژەی ژنەکان هۆڵەکەی پڕ کردبوو. پیاوەکان لە کاتێکدا رەنگیان پینەمابوو، هاواریان دەکرد، چ مانایەکی هەیە! ئەو بەزم و رەزمە چییە! ئەو

پیس و چەپەڵانە فڕێدەنە دەر! پێشخزمەتەکان بە کورسی و شوشە و هەر شتێکی بەر دەستیان کەوتبا، کەوتبوونە گیانی مشکەکان. یەکێك لە سەرۆکی چێشتلێنەرەکان بە تاوێکەوە لە چێشتخانەکە دەرپەڕی و دوای ئەو یەکێکی تر کە چەقۆی چێشتخانەی لە سەر سەری هەڵدەسوڕاندە، بە دیارکەوت. هەمووان هاوریان دەکرد، مشك! مشك! چی لەو هەموو مشکە بکەین! بەڵام منداڵەکان بە هەموو هێزی خۆیان چەپڵەیان لێدەدا و پێدەکەنین، دیار بوو زۆریان پێخۆش بوو. وەك ئەوەی لە رووی غەریزە زانیبێتیان شاهیدی رووداني بەرسەرهاتێکی خۆشن.

نەنکم وتی، ئێستا دەتوانین برۆین، ئیتر لێرە هیچ کارێکمان نەماوە. لەسەر کورسیەکەی هەستا و دەسکی جانتاکەی بە شانی داکرد.

من لە ناو دەستی راستی دابووم و برۆنۆش لە ناو دەستی چەپی.



به برۆنۆی وت، برۆنۆ! ئێستا دەتوانین تۆ بگەڕێنینەوە ناو باوەشی گەرمی خانەوادەکەت.

برۆنۆ وتی، دایکم چارەی مشکانی ناوێ.

نەنکم وتی، تێگەیشتووم، بەڵام هیچ چارمان نییە، دەبێ رابێت.

دۆزینەوەی بەرێز جێنکینز و خانمەکەی کارێکی ئاسان بوو، چونکە دەنگی قیژەی خانمی جێنکینز هەموو شوێنێکی پڕ کردبوو.

ئەو خۆی بە ملی مێردەکەیەوە هەڵواسیبوو و بە دوای خۆیدا رادەکێشا و دەیقیژاند، هێربێرت، لێرەم بەرە دەرێ! هەموو شوێنێك پڕ بووە لە مشك! ئێستا دەچنە ناو جەستەمەوە!

نەنکم چوو بۆ لایان و برۆنۆی لە ناو دەستی بەرێز جێنکینز هاویشت و وتی، کوڕە بچووکەکەتان وەرگرنەوە. دەبێ کەمێك رجیم بکەی.

برۆنۆ وتی، سلاو بابە! سلاو دایە!

دەنگی قیژەی خانمی جێنگینز زیاتر بوو. نەنکم گەڕایەوە و لە هۆڵی نان خواردن رۆیشتە دەر، هۆڵەکەی جێ هێشت و لە دەرگای ئوتێلەکە چوو دەرەوە.

کەش و هەوای دەرەوە گەرمایەکی زۆر خۆشی هەبوو. لە ناو پیادەڕۆی ئوتێلەکەدا دەنگی شەپۆلەکانی دەریا دەبیسترا.

نەنکم لە پاسەوانی بەر دەرگاکە، کە جلکێکی سەوزی لەبەر بوو، پرسی، لێرە تەکسی دەست دەکەوێ؟ پاسەوانەکە وتی، بەدڵنیایەوە دەست دەکەوێ. دوایی دوو پەنجەی خستە ناو زاری و فیتەیەکی توندی لێدا. لێی ورد بوومەوە. چەند هەفتەیەك بوو دەمویست وەك ئەو فیتە لێبدەم، بەڵام سەرکەوتوو نەدەبووم. ئێستاش ئیتر مەحاڵ بوو.

تەکسیەکە هات. پیاوێکی بە ساڵاچوو کە سمێڵێە پڕ و رەشەکانی دەگەیشتە سەر لێوی، و وەك ریشەی درەخت چووبوونە ناو لێوی سەرەوەی، لە پشت سوکانەوە دانیشتبوو، لە نەنکمی پرسی، بۆ کوێ خانم؟

لەپڕ بینی مشکێکی بچووك لە ناو دەستی نەنکمدا جێی خۆی خۆش کردووە. نۆی! ئەوە چیە؟

نەنکم وتی، ئەوە نەوەکەمە. تکایە بمان گەیەنە وێستگە.



شۆفێرە بە ساڵاچووەکە وتی، من مشکم زۆر خۆش دەوێ. کاتێك منداڵ بووم سەدان مشکم هەبوو.

دەزانی خانم، هیچ بوونەوەرێك وەك مشك وچە نانێتەوە. ئەگەر ئەوە نەوەکەت بێ، تا چەند هەفتەی تر دەبیە خاوەنی عەشیرەتێك نەتیجە و نەدیدە.

نەنکم بە شێوەیەکی سارد و ویشك وتی، تکایە بمان گەیەنە وێستگە.

ئەو وتی، ئەی بەسەر چاو.

نەنکم سواری تەکسیەکە بوو، و لەسەر کورسی پشتەوە دانیشت و منیشی لەسەر کۆشی دانا.

پرسیم، دەتەوێ بڕۆینەوە ماڵێ؟

ئەو وەڵامی دایەوە، بەڵێ، دەگەڕینەوە بۆ نەرویج!

هاوارم کرد، ئای! چەند خۆشە! زۆر سپاس نەنەگیان!

ئەو وتی، دەمزانی خۆشحاڵ دەبی.

ئەدی جانتاکانمان؟

تەکسیەکە بە شەقامەکانی بورن ماوثدا تێدەپەڕی، ئەو کەسانەی بۆ پشووی هاوێن هاتبوون، لە شەقامەکاندا دەسوڕانەوە.

نەنکم وتی، ئازیزم، حاڵت باشە؟

وتم، بەڵێ، زۆر باشە.

پەنجەی بە پشتمدا هێنا و وتی، دەبێ ئەورۆ جەژنێکی تەواو بگێڕین.

# دڵی مشکێك

لەوەی کە جارێکی تر گەڕابوومەوە بۆ نەرویج و بۆ ماڵە قەدیمیەکەی نەنکم، زۆر خۆشحاڵ بووم. بەڵام ئێستا کە ئەوەندە بچووك ببومەوە، ترسم لێنیشت نەکا وون ببم. دونیای من بەرتەسك ببۆوە و تایبەت بوو بە فەرش و پایەی مێزەکان و کورسیەکان و کونی ئەشیای ناو ماڵ. نەمدەتوانی دەرگای داخراو بکەمەوە یان شتێك لەسەر مێز دابنێم.

چەند رۆژێك کە تێپەڕی، نەنکم بە ئامێر و کەرەستەی جۆراوجۆر، کەمێکی ژیان بۆ ئاسان کردم. ئەو چەند پەییژەی دوولای باریکی لە لای دارتاش بۆ دروستکردم و لە پشت پایەی مێزەکانی دانا کە هەر کات ویستم پێیاندا سەرکەوم. و بۆ خۆشی چەند پارچە وەیار و چەند سپرینگ و غرغرە کە شتێکی قورسیان پێوە هەڵواسرابوو، چەند شتی تری بۆ کردنەوەی دەرگا دروست کرد و هەموو دەرگاکانی ماڵەوە بوونە خاوەنی یەك کەرەستەی کردنەوەی دەرگا. من تەنیا بە پەنجەکانم دەبوو گوشارم خستبایە سەر پارچە تەختەیەکی باریك تا فەنەرەکە بکێشرابا و قورسایەکەی لێ رەت بێ و دەرگاکە بکەوێتە سەر پشت.

دواتر رێبازێکی باشتری داهێنا تا ئەگەر شەوانە ویستم بچم بۆ یەکێك لە ژوورەکان ، بتوانم گلۆپەکەی هەڵکەم.

ناتوانم چۆنیەتی کار کردنەکەتان بۆ شیبکەمەوە، چۆنکە سەبارەت بە کارەبا هیچ نازانم، هەر دەتوانم ئەوەندەتان پێی بڵێم کە لە تەنیشت هەر یەك لە ژوورەکان دوگمەیەك لەسەر ئەرز بوو، کاتێك بە ئارامی پەنجەم لەسەر دادەنا، گڵۆپەکە هەڵدەبوو و کاتێك دووبارە پەنجەم لەسەر دادەنایەوە ، دەکوژایەوە.

نەنکم مووی یەکێك لە فڵچەکانی سەری لە ناوەراستەوە کردە چەند پارچە و بە دەنکە شقارتێکیەوە نووساند و فڵچەی ددانی بۆ دروست کردم و وتی، نابێ رێگە بدەی ددانەکانت خراپ بن، چونکە ناکرێ بتبەم بۆ لای پزیشکی ددان! لە وانەیە وا بیر بکاتەوە کە ئەقلم لەدەست داوە!





وتم، زۆر باشه، بەڵام لەو کاتەیەوە بوومە مشك حەز لە چکولیات و شتی شیرین ناکەم. لەبەر ئەوە پێموا نییە ددانەکانم خراپ بن.

نەنکم وتی، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ دوای هەر نان خواردنێك ددانەکانت جوان بشۆی. منیش بە قسەم کرد.

شەکردانێکی زیوی لە جیاتی وان داپێم تا هەمور شەوێ پێش نوستن خۆمی تێدا بشۆم. هیچ کەس تەنانەت پێشخزمەت و چێشتلێنەریش بۆیان نەبوو بێنە ماڵی ئێمە. ئێمە بە تەواوی بە تەنیا بووین و لە قسە کردن لەگەڵ یەکتردا زۆر خۆشحاڵ بووین.



شەوێك كە لەسەر ئەژنۆی نەنكم لە پێش ئاگرەكە درێژ ببووم، ئەو وتی، نازانم برۆنۆ چی بەسەر هاتووە.

وەڵامم دایەوە، دوور نییە باوكی بە كرێكاری ئوتێلەكەی وتبێ بیهاوێتە ناو سۆبەی دیواری.

نەنكم وتی، دەترسم وای لێكردبێ، زۆرم بەزەیی پێدادێ.

چەند خولەكێك بێدەنگ بووین. نەنكم مژێكی لە جگەرەكەیدا و منیش بە ئارامی خەریكی خەوتن بووم.

وتم، نەنەگیان دەكرێ شتێكت لێ بپرسم؟

چیت پێخۆشە بپرسە ئازیزم.

مشكەكان چەندە دەژین؟

ئەو وتی، چاوەڕوانی ئەو پرسیارە بووم.

هیچم نەوت. ئەو چاوی لە ئاگرەكەوە بڕیبوو و جگەرەی دەكێشا.

وتم، پێتنەوتم ئێمەی مشك چەندە دەژین؟



وتی، من ئەو چەند رۆژە هەر سەبارەت بە مشکان دەخوێنمەوە تا ئاگاداری بارودۆخی ژیانیان بم.

ئەی بۆ پێم ناڵێی مشکەکان چەندە دەژین؟

ئەو وتی، ئەگەر راستییەکەت دەوێ، مشکەکان تەمەنیان زۆر درێژ نییە.

پرسیم، بۆ نموونە چەندە دەژین؟

ئەو وتی، مشکە ئاسایەکان تەمەنیان لە سێ ساڵ زیاتر نییە، بەڵام تۆ مشکێکی ئاسایی نی. تۆ مشکێکی ــ مرۆڤی، ئەوەش مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

پرسیم، جیاوازیەکەی چییە؟ مشکی ــ مرۆڤ چەندە دەژی؟

ئەو وتی، مشکی ــ مرۆڤ زۆر زیاتر لە مشکی ئاسایی دەژی.

پرسیم، بۆ نموونە چەندە؟

نەنکم وتی، بەدڵنیاییەوە مشکی ــ مرۆڤ سێ ئەوەندەی مشکی ئاسایی دەژی، واتە نزیکەی نۆ ساڵ.

هاوارم کرد، چەند خۆشە! زۆر باشە! لەوە باشتر نابێ!

ئەو بە سەرسوڕمانەوە پرسی، بۆ چی لەوە باشتر نابێ؟

وتم، لەبەر ئەوەی نامەوێ لە تۆ زیاتر بژیم. چونکە ئەو کات کەس نابێ ئاگاداریم بکات.

ئەو هیچی نەوت و بە میهرەبانیەکی تایبەت دەستی بە پشت گوێم داهێنا.

من ئەو حاڵەتەم زۆر پێخۆش بوو.

پرسیم، نەنەگیان، چەند ساڵی؟

ئەو وتی، هشتاو شەش ساڵ.

تا هەشت یان نۆ ساڵی تر زیندوو دەبی؟

ئەو وتی، ئەگەر بەختم هەبێ، لەوانەیە زیندوو بم.

وتم، بەدڵنیاییەوە زیندوو دەبێ و منیش مشکێکی زۆر پیر دەبم و تۆش نەکێکی زۆر پیر و هەردووکمان بەیەکەوە دەمرین.

ئەو وتی، ئەوە باشترین حاڵەتە.

دوایی کەمێکم خەو لێ کەوت. بە بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە چاوەکانم داخستبوو و هەستم بە ئاسودەیی و ئارامی دەکرد.

نەنکم وتی، پێتخۆشە شتێکی سەیر لەبارەی خۆتەوە بزانی؟

بێ ئەوەی چاوم بکەمەوە، وتم، بەڵێ، تکا دەکەم بۆم بگێڕەوە.

ئەو وتی، یەکەمجار بڕوام بەو مەسەلەیە نەدەکرد، بەڵام پێدەچێ ڕاست بێ.

وتم، چ مەسەلەیەك؟

ئەو وتی، دڵی مشك لەڕاستیدا دڵی تۆ لە هەر خولەکێکدا پێنسەت جار لێدەدا!

جێی سەرسوڕمانە، نا؟

چاوەکانم کردەوە و وتم، ئەوە مەحاڵە.

ئەو وتی، بڕوا بکە راستدەکەم، ئەوە وەکو مەعجیزەیە!

لە ناو مێشکمدا لێکمدایەوە و هاوارم کرد، واتە هەر چرکەساتەی نۆ جار.

ئەو وتی، راستە، دڵت بەرادەیەك خێرا لێدەدا کە ترپەکەی نابیسرێ. مرۆڤ تەنیا هەرا و چەقەیەکی لاواز دەبیسێ. ئەو جلکێکی تۆڕداری لەبەر بوو و تۆڕەکانی بەری لوتمی وەخروو دێنا. ناچار بووم سەرم بخەمە ناو پەنجەکانم.

لێم پرسی، نەنەگیان، تا ئێستا گوێت لە دەنگی دڵم بووە؟

ئەو وتی، شەوانە کە لە تەنیشت من سەرت دەخەیە سەر بالیف، گوێم لە لێدانی دڵت دەبی.

دوای ئەو قسانە، هەردووکمان لە پێش ئاگرەکە دانیشتین و لە بێدەنگیدا بیرمان لەو شتانە دەکردەوە.

لە کۆتاییدا ئەو وتی، ئازیزم، دڵنیای لەوەی کە تا کۆتایی تەمەنت هەر بە مشکی دەمێنیەوە، هەست بە نیگەرانی و ناخۆشی ناکەی؟

وتم، هەرگیز. ئەگەر یەکێك خۆشی ویستی، هیچ گرنگ نییە ئەو کەسە کێ بێت و یان چ هەیکەل و شێوەیەکی هەبێ.

# کۆتایی نەمایش و خوا حافیز!

ئەو شەوە نەنکم بۆ نانی ئێواریّ، هێلکە و تەماتەی بە پارچەیەك نان خوارد و منیش پارچە پەنیرێکی قاوەیی نەرویجیم خوارد کە لە شیری بزن دروست کرابوو. من ئەو پەنیرەم ئەو کاتەی منداڵ بووم زۆر پێخۆش بوو. نەنکم لە پێش ئاگر و لەسەر کورسیە دەستەدارەکەی نانی خوارد و منیش لەسەر مێزەکە دانیشتم و لە ناو قاپێکی بچووکدا پەنیرەکەم خوارد.

وتم، نەنەگیان، ئێستا کە ئێمە جادووگەری مەزنمان لە ناو برد، هەموو جادووگەرانی جیهان لە ناو چوون؟

ئەو وەڵامی دایەوە، پێموانییە، بەدڵنیاییەوە جادووگەرانی تر لە شوێنی خۆیانن.

دەستم لە خواردن هەڵگرت، تێوەی رامام و هاوارم کرد، بەڵام، دەبێ لە ناو چووبن! بەدڵنیاییەوە لە ناو چوون!

ئەو وتی، بەداخەوە پێموانییە.

بەڵام ئەوان بە بێ جادووگەری مەزن چۆن پارە بۆ خۆیان پەیدا دەکەن؟ ئێستا کێ فەرمانیان بەسەردا دەکات و لە کۆبوونەوەی ساڵانەدا هانیان دەدا و دەرمانی ئەفسوناویان بۆ دروست دەکات؟

نەنکم وتی، کاتێك شاهەنگەکە دەمرێ، یەکێك لە مێشەکان جێگەی ئەو دەگرێتەوە، جادووگەرانیش بەمشێوەیەن. لە ناوەندی سەرکردایەتی کە شوێنی ژیانی جادووگەری مەزنە، هەمیشە جادووگەرێکی مەزنی تر لەبەر چاو دەگیرێ تا ئەگەر شتێك روویدا، کارەکان بەرێوە ببات.

هاوارم کرد، ئەی ئێمە بۆ چی ئەو کارانەمان کردن! ئەی من لەبەر هیچ و پوچ بوومەتە مشك!

ئەو وتی، ئێمە منداڵانی بەریتانیامان لە بوون بە مشك رزگار کردن. بەڕای من ئەوە کارێکی بچووك نییە.



هاوارم کرد، بەڵێ، راستە! بەڵام بەس نییە! پێموا بوو جادووگەران دوای ئەو جەریانەی کە بۆ رابەردکەیان پێشهات لە کارەکانیان پەشیمان دەبنەوە! بەڵام تۆ دەڵێی هەموو شتێك وەك جارانە!

نەنکم وتی، بەدڵنیاییەوە هەندێك جیاوازە لەگەڵ پێشتر، بۆ نموونە لە بەریتانیا ئیتر جاووگەر بوونی نییە. ئەو سەرکەوتنە زۆر گرنگە، تۆ وا بیر ناکەیەوە؟

هاوارم کرد، جادووگەرانی تری جیهان چی؟ جادووگەرانی ئەمریکا و فەرانسا و هۆڵندا و ئەلمانیا چی؟ جادووگەرانی نەرویج چ کارێك دەکەن؟

ئەو وتی، وا مەزانە من لەو ماوەیەدا بە بێکاری دانیشتبووم، من ئەو چەند رۆژە سەبارەت بەو مەسەلەیە زۆرم بیر کردۆتەوە.

کاتێك ئەو قسەیەم دەکرد، نیگایەکەم لەسەر وی بوو، لەپڕ دیتم زەردەخەنەیەکی نهێنیدار لە گۆشەی چاوەکان و چرچ و لۆچی لێوەکانی بە دیار کەوت. پرسیم، بۆچی پێدەکەنی نەنەگیان؟

ئەو وتی، دەمەوێ چەند هەواڵی سەرنج راکێشت پێڕابگەیەنم.

هەواڵی چۆن؟

دەتەوێ لە سەرەتاود هەموویت بۆ بگێڕمەوە؟

وتم، زۆر سپاس، من هەواڵە باشەکانم خۆشدەوێن.

ئەو نانەکەی تەواو کردبوو، منیش بە ئەندازەی پێویست پەنیرم خواردبوو.

ئەو لێوی بە دەسرە خاوێن کردەوە و وتی، کاتێك گەیشتینە نەرویج من یەکسەر تەلەفۆنم کرد بۆ بەریتانیا.

بە کێ؟ نەنەگیان؟

بە بەڕێوەبەری پۆلیسی **بورن** ماوثی ئازیزم وت من بەڕێوەبەری پۆلیسی هەموو نەرویجم و دەمەوێ لەبارەی پێشهاتێکی سەیر کە یەك دوو رۆژ لەومەو پێش لە ناو ئوتێلە بەشکۆیەکەدا روویدا، پرسیار بکەم.

وتم، نەنەگیان، خولەکێك بوەستە، مەحاڵە، بەڕێوەبەری پۆلیس بڕوای بە قسەکەت کردبێ.

ئەو وتی، من زۆر بە باشی دەنگی پیاوان دەردێنم. لەبەر ئەوە بڕوای پێکردم. بەڕێوەبەری پۆلیسی بورن ماوث لەوی کە بەڕێوەبەری تەواوی نەرویج تەلەفۆنی بۆ کردووە، زۆر خۆشحاڵ ببوو.

باشە، ئێستا چیت لێ پرسی؟

ناو و ئەدرەسی ئەو خانمەی کە لە ژووری ژمارە ٤٥٤ ی ئوتێلە بەشکۆیەکە بوو و ئێستاکە بزر بووە، پرسیارم لێ کرد.

هاوارم کرد، مەبەستت جادووگەری مەزنە!

بەڵێ ئازیزم.

بەڕێوەبەری پۆلیس ناو و ئەدرەسەکەی پێدای؟

بۆ قەرار بوو نەیدا. پۆلیسەکان هەمیشە یارمەتی یەکتر دەدەن.

ئای، نەنەگیان تۆ شتە گرنگەکەت بەدەست هێناوە!

نەنکم وتی، پێویستم بە ئەدرەسەکە بوو.

ئەو ئەدرەسەکەی هەبوو؟

ئەی چۆن هەیبوو. ئەو پەساپۆرتی جادووگەرەکەی لە ژوورەکەیدا دۆزیبۆوە. ناو و ئەدرەسەکەی لە ناویدا نووسرابوو. ئەدرەسەکەی لە ناو دەفتەری ئوتێلەکەشدا هەبوو. هەموو ئەوانەی دێن بۆ ئوتێل دەبێ ناو و ئەدەرسەکەیان لە ناو دەفتەری ئوتێلەکەدا بنووسرێ.

وتی، بەدڵنیاییەوە جادووگەری مەزن ناو و ئەدرەسە راستەقینەکەی لە ناو دەفتەری ئوتێلەکەدا نەنووسێوە؟

نەنکم وتی، بۆچی؟ جگە لە جادووگەران کەس نازانێ ئەو کێیە. خەڵکی پێیان وایە کە ئەو خانمێکی میهرەبان و باشە.

ئازیزم، جگە لە جادووگەران تۆ تەنیا کەسێکی کە ئەوت بە بێ نیقاب بینیوە. لەو شوێنەی لێی دەژی هەموو بە خانمێکی بە شەخسییەت و دەوڵەمەند دەیناسن کە بە دڵێکی فراوانەوە یارمەتی دامودەزگای خێرخوازی دەدات. من لێکۆڵینەوەم لەسەر ئەو موسەلەیە کردووە.

بە تامەزرۆوە وتم، نەنەگیان، بەدڵنیاییەوە ئەو ئەدرەسەی دەستت کەوتووە، هەمان ناوەندی سەرکردایەتی جادووگەری مەزنە، نا؟

نەنکم وتی، بەڵێ هەمان شوێنە و بەدڵنیاییەوە ئێستا جادووگەرە مەزنە نوێیەکە لەگەڵ بەردەستە تایبەتیەکانی لەوێ دەژی. کاربەدەستە گرنگەکان هەمیشە یەك دونیایان بەردەست و نۆکەری بە گوێ بەدەورەوەن.

هاوارم کرد، نەنەگیان، پێم بڵێ بزانم ئەو ناوەندە سەرکردایەتیە لە کوێیە؟

نەنکم وتی، ناوەندی سەرکردایەتی قەڵایەکە و گرنگیکەی لەوە دایە کە ناو و ئەدرەسی هەموو جادووگەرانی جیهانی تێدایە! ئەگینا جادووگەری مەزن نەیدەتوانی کارەکانی جێبەجێ بکات! ئەگەر وانەبا جادووگەری مەزن چۆن دەیتوانی ئەو هەموو جادووگەرانە لە وڵاتانی جۆراوجۆر بۆ کۆبوونەوەی ساڵانە لە دەوری یەك کۆدەکاتەوە؟

بە بێ سەبری هاوارم کرد، نەنەگیان، زووکە پێم بڵێ ئەو قەڵایە لە کام وڵاتەیە؟

نەنکم وتی، هەڵیهێنە.

هاوارم کرد، نەرویج!

وەڵامی دایەوە، ئافەرین! ناوەندی سەرکردایەتی لە لادێیەکی بچووکە، لەسەر نووکی چیایەك.

هەواڵێکی زۆر سەرنج ڕاکێش بوو. لەبەر زۆری خۆشحاڵی لەسەر مێزەکە کەوتمە سەما کردن. نەنکیشم لە خۆشیان هەستابوو سەر پێ و تەق تەق گۆچانەی



لە ئەرزی دەکوتا و لە ژوورەکەدا هەر سەرو خواری بوو.

بە خۆشیەوە هاواری کرد، ئێمە یەك دونیا کارمان هەیە! ئەرکێکی گەورەمان لەسەر شانە! سپاس بۆ خوای گەورە کە تۆ مشکی! مشکەکان دەتوانن بچن بۆ هەموو شوێنێك! کاری من گەیاندنی تۆیە بۆ نزیك قەڵای جادووگەری مەزن، ئەو کات زۆر بە ئاسانی دەتوانی بچی بۆ ناو قەڵایەکە و هەموو شوێنێك بە باشی بگەڕێی و بە وردی گوێ لە قسەکانیان بگری.

وەڵامم دایەوە، بەڵێ ، بەڵێ! هیچ کەس ناتوانێ ببینێ! گەڕان لە ناو قەڵایەکی گەورە لە بەرامبەر چوونە ناو چێشتخانەیەك کە پڕە لە پێشخزمەت و چێشتلێنەر، وەك گەمەیەکی منداڵانەیە!

نەنکم هاواری کرد، ئەگەر پێویست بکات، دەتوانی چەند ڕۆژ لەوێ بمێنیەوە! لە خۆشیان گۆچانەکەی لە هەوادا هەڵدەسوڕاند، لە ناکاو گۆچانەکەی بە گوڵدانێکی جوان و گەورە کە لە گۆشەیەکی ژوورەکە بوو، کەوت و گوڵدانەکە ورد و خاش بوو.

نەنكم وتی، بە قوربانی خۆت بیٚ! بەداخەوە كاری چینیٚ بوو. ئەگەر پیٚویست بیٚ دەتوانی چەند هەفتەش لە ناو ئەو قەلاْیە بمیٚنیەوە و هیچ كەسیش ئاگاداری بوونت نابیٚ. من لە ناو لادیٚییەكە ژووریٚك دەگرم و تۆش دەتوانی بە هیٚواشی شەوانە لە قەلاْیەكە بیٚیە دەریٚ تا بەیەكەوە نان بخۆین و هەواڵەكانیشم پیٚی بلیٚی.

هاوارم كرد، بەلیٚ، بەلیٚ! دەتوانم هەر شویٚنیٚكی پیٚمخۆش بیٚ لە ناو قەلاْیەكە بە ئاسانی بۆی بچم!

نەنكم وتی، كاری سەرەكی تۆ لە ناو بردنی شتەكانی ناو قەلاْیە تا ئەو دەزگایە بە تەواوی لە ناو بچیٚ!

هاوارم كرد، بەلاْم من چۆن دەتوانم شتەكانی قەلاْ لە ناو ببەم.

ئەو وتی، بۆخۆت چۆن بیر دەكەیەوە؟

وتم، نازانم.

نەنكم هاواری كرد، بە دەرمانی مشك ساز! دەرمانی هەنگاو بە هەنگاو دووبارە وەكار دەكەویٚتەوە! ئەتۆ دەتوانی ئەو دەرمانە بكەیە ناو خواردنی ئەو كەسانەی لە ناو قەلاْدا نیشتەجیٚن! چۆنیەتی دروستكردنەكەت لە یاد ماوە؟

وتم، كەمیٚك! مەبەستت ئەوەیە بۆخۆمان ئەو دەرمانە دروست بكەین؟

ئەو وتی، بۆ نابیٚ؟ چیمان لەوان كەمترە! تەنیا دەبیٚ بزانین چیمان پیٚویستە!

پرسیم، كیٚ دەتوانیٚ لە درەخت سەركەویٚ و هیٚلكەی غرغرو پەیدا بكات؟

ئەو وتی، بۆخۆم! بۆ من ناتوانم لە درەخت سەركەوم؟! نەوەندەم بە كەم مەزانە. هیٚشتاش زۆر شتم پیٚ جیٚبەجیٚ دەكریٚ! پیٚموایە وا باشە سنیش یارمەتیت بدەم نەنەگیان، لەوانەیە لەو سەرەودرا بەربیەوە.

ئەو دووبارە گۆچانەكەی هەڵسوڕاند و هاواری كرد، ئەو وردەكاریانە زۆر گرنگ نین! نابیٚ ریٚگە بدەین هیچ شتیٚك پیٚشمان پیٚی بگریٚ!

پرسیم، دوای ئەوەی جادووگەری مەزن و کەسانی نیشتەجیٚ لە ناو قەلاٚیەکە بوون بە مشك، دەبیٚ چی بکەین؟

ئەو کات قەلاٚیەکە بە تەواوی بەتاڵ دەبیٚ و دەتوانم بیٚم بۆ لات و ...

هاوارم کرد، بوەستە، دەست راگرە نەنەگیان! بیرۆکەیەکی ناخۆش بە میٚشکمدا هات!

ئەو وتی، چ بیرۆکەیەك؟

وتم، دوای ئەوەی کە شلەکە منی کردە مشك، من نەبووم بە مشکیٚکی ئاسایی کە بە تەڵە مشکەوە بیٚت. من بوومە مشکیٚك کە ئەقڵ و هۆشی هەیە و دەتوانیٚ قسە بکات و بۆ لای تەڵە مشکیش نەدەچوو.

نەنکم قسەکانی کورت کردنەوە. تیٚگەیشتبوو مەبەستم چییە.

بەردەوام بووم، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر ئیٚمە بە شلەی مشك ساز جادووگەری مەزن و جادووگەرانی تری ناو قەلاٚ بکەین بە مشك، قەلاٚیەکە پڕ دەبیٚ لە مشك ــ جادووگەر کە هەم هۆشیان هەیە و هەمیش پڕ کیٚشە و ترسناکن، مشك ــ جادووگەریٚك کە قسە دەکات و بیر دەکاتەوە! واتە ئەو هەموو جادووگەرە لە جلکی مشکدا! زۆر بیٚ مانا و گاڵتە جاڕییە!

ئەو هاواری کرد، راست دەکەی ها! بیرم لەوە نەکردبۆوە!

وتم، پیٚموانییە دەرەقەتی قەلاٚیەك بیٚم کە پڕە لە مشك.

ئەو وتی، هەروەها منیش. دەبیٚ یەکسەر لە ناو بچن. ئەوان دەبیٚ چۆن لە ئوتیٚلە بەشکۆیەکەدا بچووك بوونەوە و لەبەریٚك هەڵوەشان، لیٚرەش پارچە پارچە بن.

وتم، من ناتوانم ئەو کارە بکەم. پیٚموا نییە تۆش بتوانی نەنەگیان. تەڵە مشکیش هیچی پیٚناکریٚ.

جادووگەری مەزن کە منی کردە مشك، سەبارەت بە تەڵە مشك هەڵە بوو، نا؟

نەنکم بە بێ سەبری وتی، بۆچی، بۆچی، بەلاّم مەبەستم ئەو جادووگەرە مەزنە نییە، ئەو هەمان کات بە دەستی سەرۆکی چێشتلێنەرەکان پارچە پارچە کرا. ئێستا ئێمە کارمان بە جادووگەری مەزنی نوێ و بەردەستەکانیەتی، ئەوانەی لە ناو قەلاّکەدا دەژین. جادووگەری مەزن لە شێوەی یەك خانم بە ئەندازەی پێویست قێزەونە، چ بگات بە وەی لە شێوەی مشك کارەکانی بە ئەنجام بگەیەنێ! بەمشێوەیە کەس ناتوانێ بەرامبەری بوەستێ! لە جێی خۆم دەرپەڕیم و هاوارم کرد، تێگەیشتم! تێگەیشتم دەبێ چی بکەم!

نەنکم بە دەنگێکی بەرزەوە وتی، دەبێ چی بکەین؟

هاوارم کرد، پشیلە! دەبێ پشیلە بەکار بێنین! نەنکم تێمەوە ڕاما. دواتر پێکەنی و هاواری کرد، چ بیرۆکەیەکی نایاب! بێ وێنەیە!

هاوارم کرد، دەبێ دە یا دوازدە دانە پشیلە لە ناو قەلاّیەکەدا بەرەلاّ بکەین تا لە ماوەی پێنج خولەکدا هەموو مشکەکان لە ناو بەرن. مشکەکان هەر چەند زیرەکیش بن، دەرەقەتی پشیلە نایەن!

نەنکم دیسان گۆچانەکەی هەڵسوڕاندەوە و هاواری کرد، تۆ سیحرکەری!

ئاگاداری لەت و پەتی گولّدانە گەورەکە بە نەنەگیان.

ئەو هاواری کرد، کێ بیر لە گولّدانی شکاو دەکاتەوە! من ئەوەندە خۆشحالّ و تامەزرۆم کە ئەگەر هەموو شوێنێکیشم ببڕم، بە خەیالّمدا نایەت. وتم، تەنیا یەك شت دەمێنێ، نابێ پێش ئەوەی من خۆم لە پشیلەکان دوور بخەمەوە، بیانهێنیە ناو قەلاّ.

ئەو وتی، بەلّێن دەدەم.

پرسیم، دوای ئەوەی پشیلەکان هەموو مشکەکانیان کوشتن ئێمە دەبێ چی بکەین؟

پشیلەکان دەبەینەوە بۆ ناو لادێیەکە و قەلاّیەکەش بۆ ئێمە دەبێ.

وتم، ئەی دواتر؟

دواتر دەچینە لای فایلەکان و ناو و ئەدرەسی جادووگەرانی جیهان وەدەست دێنین!

لە کاتێکدا لە خۆشیان دەلەرزیم، وتم، دوای ئەوە چی دەکەین؟

ئەو کات، کاری سەرەکیمان دەست پێدەکات! جانتاکانمان هەڵدەگرین و بە دەوری دونیادا دەگەڕێین! ماڵیێ جادووگەران دەدۆزینەوە و تۆش دەچیە ناو ماڵەکانیان و دەرمانی مشك ساز دەکەیە ناو خواردنەکەیان. ئێمە سەردەکەوین، ئازیزم! ئەوە سەرکەوتنێکی مەزن و لەبیر نەکراوە! ئەوە ئێمەین ئەو کارە دەکەین، من و تۆ! و تا کۆتایی تەمەنمان هەر بەردەوام دەبین!

نەنکم منی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و سەری لوتمی ماچ کرد و هاواری کرد، ئەی خوای گەورە، تا چەندەها هەفتە و مانگ و ساڵ هەر سەرقاڵ دەبین! وتم، بەڵێ، وایە. بە خۆشی رایدەبوێرین!

نەنکم دووبارە ماچی کردم و هاواری کرد، رێك وادەبێ! دەبی خێرا دەست بەکار بین!



له ئەفسانەی پەریاندا، جادووگەران هەمیشە کڵاوی گێلانەی ڕەش دەکەنە سەریان و شاڵێکی ڕەش بەسەر شانیاندا دەدەن و سواری دەسکی گەسکەکانیان دەبن. بەڵام ئەو جادووگەرانەی لەم چیرۆکەدا لەگەڵیان ئاشنا دەبین هیچ کام لەو کارانە ناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاوی زاریان شینە و نینۆکیان نییە و پێیەکانیان پەنجەی نییە و سەریان بە تەواوی تاس و کەچەڵە لە شێوەی مرۆڤی ئاسایی دەردەکەون و لەوانەیە زۆر میهرەبان بێنە بەرچاو. بەڵام بەڵای وا سەیر بەسەر قارەمانی چیرۆکەکەماندا دێنن لە ترسان چاومان پێی زەق دەبێ.

خەیاڵی بەهێز و پڕ بەر و سەرنج ڕاکێشی ڕۆڵد داڵ، نووسەری بەریتانی بە ئەسڵ نەرویجی، جوانییەکی بێ وێنەی بەخشیوەتە بەرهەمەکانی و لە سەراسەری جیهاندا خوێنەرێکی یەگجار زۆریان بۆ خۆیان پەیدا کردووە.



نرخ (٣٠٠٠) دینار





خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING & PUBLISHING
www.mukiryani.com
2015